# کوردستان لە رۆژگارە سەختەکاندا

## کۆمەڵە وتارێکی سیاسی شیکاری رەخنەئامێزە

## بەرگی دووەم

د. کامەران مەنتک

2022

## وتەیەکی پێویست...

گومانی تیانیه کوردستان ئەمڕۆ لە سەختترین قۆناغی خۆیدا دەژیت، گەلی کورد لەژێر سایەی حیزبی گەندەڵ وسەرکردایەتیەکی خۆپەرست و نابەرپرس، خەریکە رۆژ بەرۆژ زیاتر خاکی کوردستان لەدەست دەدات و دیمۆگرافیای کوردستان بەشێوەیەکی بەرنامە بۆ داڕێژراو دێتە گۆڕین، ماکینەیەکی میدیایی زەبەلاح کار بۆ فریودانی رای گشتی کوردستان وساختەکردنی مێژوو دەکات، لەنێو ئەو جەنجاڵیەدا هەوڵمداوە بەوردی چاودێری رووداوەکان بکەم وخوێندنەوە وشیکردنەوەیان بۆ بکەم، تاکە ئامانجم لەمەدا خزمەتکردنی نەتەوەکەی خۆمە ودەمەوێت ئەگەر بۆ کەمێکیش بێت برینەکانی سارێژ بکەم.

جێگەی داخە لەژێر ئالای بەناو ئازادی ولەژێر دەسەلاتێکی بەناو کوردیدا، ئەوەی دژی کورد دەگوزەرێت، هیچ دوژمنێکی کورد، لەماوەی سەد ساڵی رابردوودا زاتی ئەوەی نەکردووە بیکات، سەر زەمین وژێر زەمینی ئەو ولاتەیان تالان کرد ولەسەر سکی برسی خەڵک، ورگی خۆیان گەورە دەکەن وهەموو بەها پیرۆزەکانی ئەم ولاتەیان بێبەهاو چرووک کرد، هیچ پیرۆزیەکیان نەهێشت، لەوەتەی وەک کلۆ لەشاخەکان هاتنە خوارەوە وهێرشیان کردە سەر شارەکان، لەگەڵ خۆیان ولات فرۆشی وسیخوڕیکردن بۆ داگیرکەرانی کوردستانیان هێنایە ناو دڵی میللەت وهەموو خەون وئومێدێکی تاکی کوردیان بە نیشتمانەکەی ریسوا کرد، وایان کرد، خەڵکی کوردستان بەئاشکرا رەحمەت بۆ رژێمێکی دیکتاتۆری وەک رژێمەکەی (سەدام حوسێن) بنێرێت، کە بەهەزاران گەنج وژن ومنداڵی کوردی ئەنفال کردو هەڵەبجەو ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکانی

کوردستانی کیمیا بارانکرد، بەشێکیان بوونەتە بەکرێگیراوی تورکیاو بەشەکەی تریش بەکریگیراوی ئێران، هەندێک بەناو حیزبی بچووکی تر لەو ناوەندەدا دەلەوەڕێن وسیخوڕی بۆ هەموو لایەک دەکەن! لە باشووری کوردستان دا پیشەی سیخوڕیان کردە باشترین پیشە و نەک تەنیا سەرکردایەتیان، بگرە کەسانی خوارەوەی حیزبەکانیش لەلایەن دەزگا سیخوڕییە هەرێمیەکانەوە بەکاردەهێنرێن، بەم چەشنە باشووری کوردستان بۆتە گۆڕستانی هەموو کوردە دڵسۆزەکانی پارچەکانی تر ولێرەوە کار لەسەر پاکتاو کردن وتێکشکاندنی میللەتێک دەکرێت.

ئەو بێئومێدیە وایکردووە کۆڕەوێکی تری گەنجانی کورد بۆ دەرەوەی وڵات دەست پێبکات ورۆژانە لە میدیا جیهانیەکاندا هەواڵی خنکان وکوژرانی گەنجانی کورد لەدەریاکان ولەرێی هەندەراندا بڵاو دەکرێتەوە، بەبێ ئەوەی ویژدانی یەک بەرپرس بجولێنێت! خاکی کوردستانیان بەسەر زەمین وژێر زەمینەوە هەراج کردووەو لەڕێگەی ئەوانەوە خەریکە دیمۆگرافیای کوردستان بەتەواوی دەگۆڕێت و پەیتا پەیتا مۆرکی کورد بوون لەدەست دەدات، ژیانیان لەبەرچاوی خەڵک رەش کردووە و تاکی کورد لەشارەکەی خۆیدا بۆتە خزمەتکاری عارەب ورۆم وعەجەم!. بەناو رۆیشتن وکۆلکە خوێندەواری کورد بوونەتە کۆیلەی کۆمەڵێک ئایدیۆلۆژیاو ئەوانیش ئەو حیزبانەدا بوونەتە گەورەترین مەترسی بۆ سەر گەلەکەی خۆیان ورۆژانە لەمیدیا وتۆڕە کۆمەلایەتیەکاندا زەهر بڵاو دەکەنەوە!.

ئەم کتێبە زادەی دنیابینی خوێندنەوەیەکی ئەکادیمیانەو زانستیانەیە، کە لەرۆژگارو سەردەمێکی ئەنگوستە چاودا نووسراوەتەوە، کۆی ئەو وتارانە رەنگدانەوەی رووداوەکانی ساڵی (2021) کوردستان

بەگشتی وباشووری کوردستان بەتایبەتیە، بۆ پاراستن وهەڵگرتنیان بۆ مێژوو، بۆئەوەی وەک گەواهیدەرێک راستیەکان بۆ نەوەکانی ئاینده بگوازێتەوە، لەدوو توێی ئەم کتێبەدا بەشێوەیەکی ئەلیکترۆنی بڵاویان دەکەمەوە، بۆئەوەی بگاتە دەست زۆرترین خوێنەری کورد.

هیوادارم بەرگی دووەمی کوردستان لەرۆژگارە سەختەکاندا، کەلێنێک لە کتێبخانەی کوردی دا پر بکاتەوە وببێتە ئاوێنەیەکی بێگەرد بۆ گواستنەوەی راستیەکان وشیکردنەوەی دۆخی کوردستان بۆ نەوەکانی داهاتوو.

د. کامەران مەنتک

2022\1\2

## پەیامێک بۆ شێروان شێروانی ڕۆژنامەنووس

2021\1\19

چەندە سەختە ئەم ڕۆژگارە، وەکو گۆرانی شاعیر دەڵێت، کا بۆ سەگ دانراوەو ئێسقانیش بۆ ئەسپ، چەندە سەخت و فریودەرە ئەم ڕۆژگارە، ئێمە بۆچی خەباتمان کردو خوێنمان ڕشت، کەچی چی ڕوویدا، ئێمە نەماندەویست زیندانێکی بەعس بە زیندانێکی کوردی بگۆڕینەوە، ئێمە نەماندەویست جەلادێکی کوردی لە جێگای جەلادێکی عەرەب دابنێین، ئێمە نەماندەویست دزێکی پەرپووت بەدزێکی پۆشتەو بۆینباخ لەمل بگۆڕینەوە، ئێمە نەماندەویست حزبێکی بەعسی عەرەبی، بە حزبێکی بەعسی کوردی بگۆڕینەوە، ئێمە نەماندەویست دایکان و باوکانی وڵات چیتر لە دووری ڕۆڵەکانیان فرمێسک هەڵڕێژن و ماڵئاوایی بکەن، ئێمە هەرگیز نەماندەویست نادادپەروەریەکانی کوردی جێگای نادادپەروەریەکانی بەعس بگرێتەوە، ئێمە بۆ ئەوە خەباتمان نەکرد لەداگیرکەرێکەوە ڕزگاربین و بکەوینە باوەشی چەندین داگیرکەری ترەوە، ئێمە بۆئەوە خوێنمان ڕشت وڵات جوانتر بێت، مرۆڤەکان و هەموو بوونەوەرێکی ئەم وڵاتە بەبەختەوەری بژین، ئێمە بۆئەوە خەباتمان کرد، زیندانەکان بکرێنە باخچەو قوتابخانەو کتێبخانە، ئێمە ویستمان لەجیاتی شۆڕشگێڕو گەنجانی دڵسۆزی وڵاتپارێز، دزو تاوانبارو وڵات فرۆشان بخەینە کونجی زیندانەکانەوە، ئێمە دەمانویست

ناشرینیەکانی زیندانەکانیش جوانتر بکەین، دەمانویست فرمێسکی دایکان و حەسرەتی باوکان بە بزەو خەندە بگۆڕینەوە، ئێمە دەمانویست وڵات جێگای هەمووانی تێدا بێتەوە، ئێمە دەمانویست چیتر بەهێز بێهێز قوت نەدات، ئێمە دەمانویست لەجیاتی یاسای دارستان، یاسای یەکسانی و مرۆڤ دۆستی و میهرەبانی دابڕێژین، کەچی جێگای داخە برای بەڕێزم، ئەوەی ئێمە ویستمان ڕێک ئەوان نەیانویست، ئەوەی ئێمە کردمان ڕێک ئەوان پێچەوانەکەیان کردەوە، وڵاتیان کردە ئافرەتێکی سۆزانی و هەرشەوەی خستیانە باوەشی دوژمنێکەوە، خوێنی خاکیان هەڕاجکردو ملوانکەی سەربەرزیان خستە گەردنی داگیرکەرانی کوردستانەوە، ئەوان هەموو شتە جوانەکانی وڵاتیان ناشرینکرد، ئەوان هەموو بەها بەرزەکانی ئەو میللەتەیان بێبەها کرد، ئەوان ئەو گەنجانەیان ناچار کرد، کە ئامادەبوون خوێنیان لەپێناو وڵات بڕێژن، جەستەی خۆیان بکەنە خۆراکی دەریاکان، ئەوان لەجیاتی تاوانیارو بکوژو ئەنفالچییەکان، شۆڕشگێڕو دڵسۆزان و گەنجانی خێر لەخۆنەدیویان سزاداو خستە کونجی زیندانەکانەوە، بۆیە تۆش وەک گەنجێکی کۆست کەوتەی ئەم وڵاتە هەتککراوە، لات ئاسایی بێت لە کونجی زیندانەوە فرمێسک بۆ دوامالْئاوایی باوکە پیرو پەککەوتەکەت بڕێژیت، بەئەندێشە تەرمەکەی بۆ سەر گۆڕستانە بێنازەکانی کوردستان بەڕێبکەی، ئاساییە، تۆش وەک هەزاران گەنجی تری ئەم وڵاتە، نەتوانی دەست بە دواتوێشووی باوکەکە دڵشکاوەت بگریت و دوا ماچی ئاگرینی کۆچی بێگەڕانەوەی لێبکەیت، ئاساییە لە وڵاتێکی هەڕاجکراودا گەنجانی وەک تۆ ناچار بن بەفرمێسکە مرواریەکانیانەوە، بەدەستە ئەفسووناویەکانیانەوە، ماڵئاوایی لە تەرمی

باوک و خۆشەویستانیان بکەن و بە دزەنیگایەکیشەوە سەیری ئەو خۆرە بکە، کە لەودیو رۆچنەی زیندانەکاندا بە تامەزرۆییەوە هەڵدێت.

## له پەنای شەڕی پەکەکەوە چی دەگوزەرێت

2021\1\28

هەرکاتێک وەزیرێکی تورکیا سەردانی بەغداو هەولێر بکات، پیلانێک لە ئارادایە، بۆیە ئەو سەردانە کت و پڕەی ( خلوسی ئاکادار) زەنگی مەترسی جەولەیەکی تری شەڕ لەناوچەکە لێدەدات، بەتایبەتی ئەو سەردانە لەکاتێکدایە، کەبەرەو بەهاردەچین و زۆربەی شەڕە گەورەکانی کوردیش لەو وەرزەدا بووە، لەبەرئەوەی لەبەر سەختی چیاکان پەلاماری کوردستان دان لە زستان کارێکی سەختەو بەرامبەر ئەوەش زستان دەرفەتێکی باشە بۆ خۆئامادەکردنی تەواو بۆ شەڕ. هاوکات ئەو سەردانەی ئاکار لەکاتێکدایە پەیوەندیەکانی نێوان هەرێم و بەغدا، ئەگەرچی بەردەوامن لەگفتوگۆ، بەڵام لەدۆخێکی سەختدایەو گرژیەکان لەنێوان ئەو دوولایەنە تادێت قووڵتر دەبیتەوە، ئەوەی جێگای داخە بەغدا سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەستهیناوەو توانیویەتی ناومالی کورد لەرەگەوە دابەش بکات و کۆمەڵگای کوردی لەناخەوە بنکۆڵ بکات، ئەمەش واتای ئەوەیە هێزی بەرەنگاربوونەوەی کوردی لە پەرتەوازەییەکی گەورەدایە. جێگای داخە پەیوەندیەکانی هەریم لەگەڵ رۆژئاواو ئەمریکاش دوای ریفراندۆم ساردی تیکەوتووەو ئەگەر بەرووکەش گرژیش نەبێت، ئەو گۆڕانانەی لەسەر ئاستی هاوسەنگی هێز لەناوچەکە روویداوە، کارتی کوردی تا رادەیەکی زۆر بێهیز کردووە. بۆیە تورکیا دەیەوێت ئەو دەرفەتە بقۆزێتەوە وەک ساڵانی

پێشتر(2017-2018-2019) دەستی زیاتر لە مەسەلەی کورد بوەشێنێت،  لەباشوورەوە بەناوی لێدانی هێزەکانی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە دەیەوێت کورد بخاتەوە نێو شەڕێکی ناوخۆیی مەترسیدار، لە رۆژئاوای کوردستانیش پێدەچێت هەمدیس گڵۆپی سەوزی لەلایەن روسیاو ئەمریکاو ناتۆوە بۆ هەڵکرابێت بۆئەوەی پەلاماری (عەین عیسا) بدات. ئەوەی دۆخەکە ئاڵۆزتر دەکات، ئەوەیە، کە لەگەڵ ئەو پێشوەچوونانە، پیلانێکی هەرێمی ترسناک لە پشتە پەردە بەدیدەکرێت  و یەکێک لە سیناریۆ ترسناکەکانی ئەو پیلانەش گەڕاندنەوەی سوپای ئێراقە، بۆ هەرێمی کوردستان لەپەنای شەڕی پەکەکەوە، یاخود لەپەنای سەپاندنی دەسەلاتی حکومەتی فیدڕاڵیەوە بەسەر بۆڕیە نەوتەکان، پێدەچیت جۆرە رێککەوتنێکی هەرێمی لەم لایەنەوە ئەنجام درابێت و هەڕەشەکانی تورکیاش بەشێک بێت لە سیناریۆی گەڕاندنەوەی سوپای ئێراق بۆ سەر سنوورەکان و گەڕاندنەوەی دۆخی باشووری کوردستان، بۆ قۆناغی بەر لە راپەڕین. ئەوەی جێگای نیگەرانیە دیارە بەهۆی ئەو شەڕە دەروونیەی لە هەرێمی کوردستان دەگوزەرێت، رەنگ بێت زۆرینەی خەلک پێشوازی لە سوپای ئیراق بکات، بەبێئەوەی لە دەرئەنجامی مەترسیداری گەڕانەوەی ئەو سوپایە تێبگەن، هاوکات واپێدەچیت بەشێکی هێزی کوردی، کەیەکێتی نیشتمانی کوردستان و بەشێک لەوانەی خۆیان وەک ئۆپۆزسیۆن دەنوێنن، بیانەوێت بەڕەکە لەژێر پێی پارتی دیموکراتی کوردستان دەربێنن و ژێر بەژێر لەگەل بەغدا رێککەوتوون، ئەمەش ئەوەمان بۆ رووندەکاتەوە، کە خەڵکی هەرێمی کوردستان دوچاری چ سەرگەردانیەک کراوە!. لە هەموو حالەتەکاندا

پێدەچێت ئەو بەهارەش، ئەگەر زووتریش نەبێت، شەڕو ماڵوێرانی روو لەکوردستان بکاتەوە، کە جێگای داخە زەرەرمەندی یەکەم لە هەر شەڕێک و پێشوەچوونێکی لەم شێوەیەدا خەڵکی کوردستان و مەسەلەی کورد دەبێت.

## توركیا چی لەکوردستان دەوێت؟

2021\2\2

دیسان میدیاکانی تورکیا هەواڵی هێرشێکی فراوانیان بۆ سەر کورد لەباکوورو باشوری کوردستان راگەیاند، دیسان تورکیا دەیەوێت کوردستان بکاتەوە گۆڕەپانی شەڕو سیاسەتە دوژمنکاریەکانی خۆی پیادە بکات. مەبەستی تورکیا لەو هێرشانە زۆر مەترسیدارترە لەوەی باس دەکرێت، تورکیا بەبیانووی شەڕی پەکەکەوە شەڕی هەموو کوردو خاکی کوردستان دەکات. جێگای داخە تا ئێستا کورد لەو ستراتیژیە قووڵ و ترسناکەی تورکیا نەگەیشتووە، کە دەیەوێت بەیەکجاری مەسەلەیک بنەبڕ بکات، کە پێی دەگوترێت مەسەلەی کورد ئەو هەڕەشەیە، کە لەراستیدا نەک هەر هەڕەشە نیە بگرە فاکتەرێکی بەهێزیشە ئەگەر بەشێوەیەکی تەندروست و ئیرادەیەکی سەربەخۆ کاری لەسەربکات، بۆ هەتا هەتایە لەکۆڵ بکاتەوە. تورکیا سیاسەتێک جێبەجێدەکات، کە سیاسەتی پۆست مۆدێرنیتەیەو بە وەکالەتی زلهێزە جیهانیەکان ئەو کارە دەکات، دەیەوێت دیمۆگرافیای کوردستان بگۆڕێت ئەو ناوچە وشکاییەی ئۆراسیا، کە چارەنووسی سیستەمی جیهانی و ململانێیە جیهانیەکانی تیادا یەکلایی دەبێتەوە، بەیەکجاری لەبن دەستی کورد دەربێنێت، تورکیا بەچڕی کار لەسەرە ئەو دەکات، کە دیمۆگرافیای ئەو ناوچانە بگۆڕێت، کە لەسەر دەریای سپی ناوەڕاستەوە دەستپێدەکەن و درێژدەبنەوە تاوەکو دەگەنە ئەو ناوچانەی دەکەوێتە ژێر هەژموونی ئێران، کێشەی

زینی وەرتێ ئەو خاڵە بوو، کە تورکیا بۆ دەستنیشانکردنی دوا هەنگاوەکانی خۆی دەستپێکردو دوای ئەوە شەڕەکانی لەنێوان ئەو دوو خاڵەدا چڕتر کردەوە. ناوچەکانی دوای ئەو خاڵەش دەکەویتە ژێر هەژموونی ئێران، کە ئەویش نەک هەر لەوناوچانە بەڵکو بەقووڵاییەوە هاتۆتە ناوەوە دەوێت هەریمی کوردستانیش لەرەگەوە هەلکەنێت.

دەبێت بەباشی لەو راستیە تاڵە تێبگەین، کە مەسەلەی شەڕی تورکیا دژی کورد شەڕێکی جیهانیەو لەسەر پانتاییەکی جیۆپۆلەتیکی فراوان بەڕێوە دەچێت و بەدورو نزیک پەیوەندی ویستی سەربەخۆی تورکیاو پڕۆژەی عوسمانیە نوێیەکانەوە نیە، چونکە ئێمە دەزانین لەسەرەتای سەدەی شانزەهەم کاتێک عوسمانیەکان بەئاڕاستەی رۆژهەڵات کاریان دەکرد، لەگەڵ کوردەکان رێککەوتن، ئەمەش گوڕوتینێکی تری بە ئیمپراتۆریای عوسمانی بەخشی و بووە هۆکارێکی گرنگ بۆ زۆر لەسەرکەوتنەکانیان، پەیوەندی عوسمانیەکان و کورد دوای هاتنی مۆدێرنیتەی رۆژئاوا بۆ رۆژهەڵات، ئەوەی لەمێژووی عوسمانیەکان پێی دەگوترێت قۆناغی چاکسازی و هەردوو پڕۆژەی خەتی هومایۆن و خەتی شەریفی گوڵخانەی لێکەوتەوە، بەرەو هەڵوەشانەوەو تێکچوون چوو. لەگەڵ هاتنی مۆدێرنیتەی رۆژئاواو لەپەنای سەرهەڵدانی بیری ناسیونالیستیدا هەموو نەتەوەکانی تری ناو دەوڵەتی عوسمانی جینۆساید کران و بەشێوەیەکی راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ هەوڵی سڕینەوەیان درا. بۆیە لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم سەرەتای سەدەی بیستەم جینۆسایدو قڕکردنی ئەرمەنی و کوردەکان دەستپێدەکات، لەسەردەمی ئەتاتورک، کە هەموو سەرچاوە

مێژووییەکان وەک دروستکراوێکی رۆژئاوای ناودەهێنن، پرۆسەی سڕینەوەی کورد بەشێوەیەکی زۆر مەترسیدار بەڕێوە دەچێت.

لەسەردەمی ئاکپارتیدا، کە دەیەوێت لەسەر بنەمای پۆست مۆدێرنیتەوە مامەڵە لەگەڵ کورد بکات، هەمدیس بۆتە داردەستێکی رۆژئاواو بەیاریکردن لەسەر پەتی هەردوو بەرەی ئۆراسی و جیهانگەرایی ئەمریکی، دەیەوێت کار لەسەر داڕشتنەوەی نەخشەی دیمۆگرافی کوردستان بکات. ئەوەی تورکیا دەیکات بەگڵۆپی سەوزی روسیاو ئەمریکاو ناتۆو تەنانەت چینیشە، بۆیە دەبینین تورکیا بەشێوەیەکی زۆر مەترسیدار دەستی ئاوەڵا کراوەو کەوتۆتە وێزەی کورد، نەک هەر بەتنیا مرۆڤی کورد جینۆساید دەکات، بەڵکو خاکی کوردستانیش سووتماک دەکات و دەیەوێت داروبەردی ئەو وڵاتە لەرەگەوە هەڵکەنێت، ئەوەی ئەو بارهەڵگرانە ببینێت، کە رۆژانە لەناوچە سنووریەکان داربەڕووە رەسەنەکانی کوردستان دەبڕنەوەو دەیگوازنەوە تورکیا، بەئاسانی لەم راستیە تێدەگات، بەراستی کاتی ئەوە هاتووە کورد لەو مەترسیە تێبگات و خۆی لەو خوێندنەوە تەسک و ناوچەیی و خێڵەکیانە بەدوور بگرێت، کە بۆ سیاسەتەکانی تورکیا بەتایبەتی ململانێکانی ناوچەکە بەگشتی دەکرێت، ئێستا نەک هەرێمی کوردستان، نەک پارتی کرێکارانی کوردستان، بەڵکو هەموو خاکی کوردستان لەبەردەم هەڕەشەو مەترسیەکی زۆر جدیدایە پێویستە کوردو هێزە کوردیەکان لەو مەترسیانە تێبگەن، ئێمە لەدۆخێکداین، کراوینەتە گیانی یەکترو رۆژانەش، لەهەموو سنوورەکانی کوردستان ناوچەی زیاتر لەدەست دەدەین و وڵاتەکەمان زیاتر هەتک دەکرێت.

## کێشەی ترامپ لەکوێدابوو؟

2021\2\6

زۆر لەخەڵکی کوردستان خەونی حوشتریان لەسەر ئەمریکا هەڵچنیوە، پشتیان بەئەمریکا بەستوەو وەک تاکە فریادڕەسێک دەیبینن بۆ رزگارکردنی لەو دۆخەی تیایدایە، وەک سەرۆکی ئەمریکا دۆناڵد ترامپ لەکاتی هێرشی تورکیا بۆ سەر گرێسپی و سەرێکانی گوتی: کوردەکان بەرامبەر یەکتر دانیشتوون و چاوەڕوانی ئەوە دەکەن ئیمە بچینە شەڕ لەگەڵ تورکیا و بەرگریان لێبکەین، بەهەموو ئەقڵی خۆیان پییان وایە ئیمە تورکیا ئەندامی ناتۆ بە کوردەکان دەدەین!؟ زۆر رەخنە لەناوەوەو دەرەوەی ئەمریکا لە ترامپ گیرا، هەموو رەخەنکانیش رەهەندێکی سیاسیان هەبوو، لەناوەوەی ئەمریکا وەک رەخنەی قۆناغی پێش هەڵبژاردن هەوڵیان پشتی ترامپ لەزەوی بدەن و رێگا بۆ سەرکەوتنی دیموکراتەکان خۆشبکەن، لەدەرەوەش رەخنەکان زیاتر فرمێسکیکی تیمساحانە بوو، ئەگینا ئەوانەی رەخنەیان لەهەلوێستی ئیدارەی ئەمریکاو تورکیا دەگرت، خۆیان لەژێرەوە یارمەتی تورکیایان دەداو تورکیا بەچەکی ئەوان پەلاماری رۆژئاوای کوردستانی دەدا، لەوانەش دەولەتە ئەوروپیەکان و بەپلەی یەکەمیش ئەڵمانەکان.

کەواتە کێشەی ترامپ لەکوێدایە؟ کێشەی هەرە گەورەی ترامپ لە راستگۆییەکەی دابوو، کە رووی راستەقینەی سیاسەتی ئەمریکای لەجیهان ئاشکرا کرد، جیاوازی ترامپ لەگەڵ سەرۆکەکانی تری ئەمریکا

ئەوەبوو ئەو راستیەکانی دەگوت و ئەوانەی تر راستیەکانیان دەشاردەوە،
ئەگینا ئەو سیاسەتەی ترامپ پیادەی دەکرد بەرامبەر بەکورد هەمان ئەو
سیاسەتە قێزەونە بوو، کە لەدولی جەنگی یەکەمی جیهان و بەشێوەیەکی
چڕتریش لەدوای جەنگی دوەمی جیهانیەوە بەرامبەر کورد پیادەی کورد،
ئەمریکا هەمیشە کوردی وەکو کارتێک بەکارهێناوە و هەرکاتێک کاری
پێنەمابێت سرِی کردووە یاخود فرێیداوە، لەهیچ کاتیکی تەنگانە ئەمریکا
پشتی کوردی نەگرتووە، هەموو سیستەمە دیکاتاتۆرەکانی ئەو ناوچەیە،
بەم رژێمانەی کوردیشیان جینۆسایدکردو جینۆساید دەکەن داردەستی
ئەمریکان، تورکیا، کە بەهەموو شێوەیەک هەوڵی سرِینەوە لەناوبردنی
کورد دەدات، سەرباری ئەوەی لەروکەشدا بەهۆی نزیکبوونەوەی
لەروسەکان هەندێک گرژی لەپەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەمریکیەکان دروست
بوو، کەچی تا ئێستا نزیکترین هاوپەیمانی ئەمریکایە. ئەوەی ترامپ گوتی،
کیسنجەریش نزیکەی 45 سال بەرلەو هەمان شتی گوت و هەمان
شتیشیکرد لە 1975 کاتێک کاریان بەکورد نەماو بە چرکەیەک
خەونەکانی کوردیان کوژاندەوە، کیسنجەر راشکاونە گوتی ئەمرکیا
دەولەتێکی گەورەیەو ستراتیژیەتی خۆی هەیە، ئەمریکا رێکخراوێکی
خێرخوازی نیە، ئەوەی کتێبەکەی بکوژی ئابوری برکنز بخوێنیتەوە بە
ئاسانی لەوە تیدەگات، کە ئەمریکا چۆن سەرۆکەکان دروست دەکات و
چۆن دەستەمۆیان دەکات و لەرێگای ئەوانەوە گەندەڵی لەوڵاتەکانیان
بلاودەکاتەوەو دەیەوێت لەرێگای ئابوریەوە نەتەوەکان ملکەچ بکات، ئەو
گەندەڵی و تاوان و کوشت و برِەی لەنێوان دەوڵەتەکان و لەناوەخۆی
دەوڵەتە ستەمکاریەکانی رۆژهەلات و ئەفرۆئاسیا روودەدات، بەپلەی

یەکەم دەستی ئەمرکیای لە پشتەوەیە، ئەوە ئەمریکایە پشتگیری دەسەڵاتە گەندەڵەکان دەکات دژی گەلەکانی خۆیان، ئەگەر ئەمریکا پشتگیری ئەو رژێمە دیکتاتۆرو ستەمکارانەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست نەکات، ئەوا بەماوەیەکی کەم دەکەونە ژێر چنگی گەلە ستەمدیدەو تووڕەکانیان دەربازیان نابێت، ئەمریکایە پشتی دەسڵاتدارنی سعودیە، دەولەتانی کەنداو، رژێمی سەدام...هتد گرت دژی گەلەکانیان چەکاریکردن، کام دەولەت لەو دەولەتانە ئەو چەکانەی بەملیاران دۆلار لەئەمرکیای کڕیوەو دەیکڕیت دژی دوژمنانی خۆی بەکاریهێناوە، هەموویان بە پاڵپشتی ئەمرکیا دژی گەلەکانی خۆیان بەکاریانهیناوە، وەک بەرپرسێکی ئیسرائیلی گوتی رژیمی سوریا سەدان ملیۆن دۆلاری لەچەکی کیمیاوی سەرف کردو دواتر دژی گەلەکەی خۆی بەکاریهێنا، ئەو راستیاننە بۆ خەڵکی کوردستان رەنگ بیت زۆر زەق و بارچاوتر بیت، کە ئەمریکا تا ئیستا پاڵپشتی لەدەسەڵاتێکی گەندەڵ دەکات و هەموو چەکیکیان پێدەبەخشێت بۆ لێدان و سەرکوتکردنی نەتەوەکەی خۆیان، ئەگەر ئەمرکیا بۆ چرکەساتێک پشت لەو حزبە کوردیانە بکات ئەوا لافاوی تووڕەیی خەلک زۆر بەخێرایی رایاندەماڵێت، ئەوە ئەمریکایە لە رۆژئاوا ، لەباشوور کورد لەپێناو بەرژەوەندیەکانی خۆی بەکاردێنیت و لەکاتی تەنگانەدا پشتیان تیدەکات، ئەگەر ئەمرکیا گلۆپی سەوز بۆ فڕۆکەکانی تورکیا دانەگیرسێنیت فڕۆکەکانی تورکیا چۆن دەتوانن رۆژانە بێنە باشوری کوردستان و داروبەردی ئەو بەشەی کوردستان وێران و سوتماک بکەن، لەژیر سەرپەرشتی ئەمریکاو ئەوروپاو روسیایە تورکیا لەبەرزەقەی چاوانی دونیا خەریکە میللەتی کورد لەباکووری کوردستان

لەناو دەبات، بۆیە ترامپ راستگۆترین سەرۆکی ئەمریکا بوو، خێرا دووریان خستەوە بۆئەوەی زیاتر رووی رەشی ئەمریکا بەجیهان نیشان نەدات، بۆیە خۆی بووە قوربانی راستگۆییەکەی، هاوکان دەرفەتێکی باشیشی بۆ ئەو گەلانە ، وەکو گەلی کورد، کە لەگوێی گادا خەوتوون، بۆئەوەی چیتر فریونەخۆن وپشت بەئە مریکا نەبەستن و بە دەهۆل و زورڕنای ئەو هەڵنەپەڕن!.

## لەرۆژی زمانی دایکدا

## کێ زمانی کوردی دەپارێزێت؟

2021\2\21

زیاتر لە 2000 ساڵە زمانی کوردی، بەهۆی ئەو شەپۆلی داگیرکاریانەی کوردستانی گرتۆەوە رووبەرووی هەڕەشەی سڕینەوەو لەناوچوون بۆتەوە، ئەو هێرشانە توانیان کەلتوورو شارستانیەتی کوردی، لەرەگ و ریشەوە هەلکەنن و شوینەواری نەهێڵن، بەڵام نەیانتوانی زمانی کوردی لەناوبەرن. یەکیک لەهۆکارەکانی مانەوەی زمانی کوردی، ئیرادەی مانەوە بووە لای نەتەوەی کورد، ئەوانەی زمانی کوردیان پاراست خەڵکی دەسەڵاتدارو سیاسەتمەدارو پیاوانی ئاینیی نەبوون، بەڵکو خەڵکە سادەو رەشۆکیەکە بوو، کە نەک هەر دەستیان بەو زمانە گرت، بگرە بە هەموو شێوەیەک رێزیان گرت و پاراستیان، لەکاتێکدا خوێندەوارەکانی کورد شانازیان بەزمانی فارسی و عەرەبی و تورکی دەکرد، خەڵکە سادەکە زمانی کوردیان بەپاراوی دەهێشتەوە، وشەکانی بێگانە خەلکی سادهو گوندنشین نەیانهێنایە ناو زمانی کوردی، ئەوانە هێنایان، کە خۆیان بەخویندەوارو بازرگان و سیاسەتمەدار دەزانی، تەنانەت ئەو وشانەش، کە لەناو زمانە بێگانەکانەوە دەهینرانە ناو زمانی کورد، دەستکاری دەکراو مۆرکێکی کوردانەی پیدەبەخشرا، بەشێوەیەک دەبووە بەشێک لەزمانی کوردی و بەئاستەم بنەچەکەی دەناسرایەوە.

لەهەموو قۆناغەکاندا، زمانی کوردی وەک قۆناغی دەسەڵاتداریەتی کورد لەباشووری کوردستان سووکایەتی پینەکراوەو نەشیوینراوە، بەپێچەوانەی سەردەمی بەعس، کە خەڵک لەسەر زمانی کوردی گیانی خۆی دەکردە قوربانی، لەو قۆناغەدا زمانی کوردی ریسوا کراو زمانەکانی بێگانە هێنرایە پێشەوە، زۆرینەی هەرە زۆری کەناڵە کوردیەکان خۆیان وا بەپێشکەوتوو و رۆشنبیر دێتە بەرچاو کاتیک وشەیەکی بێگانە، یاخود رستەیەکی زمانێکی بێگانە بەکاردەهێنن، شارەکان پڕبوون لەنووسراوی سەر فرۆشگاکان بەزمانی بێگانە، منداڵەکان هەر بەساواییەوە نێردرانە قوتابخانە ئینگلیزی و عەرەبی و تورکیەکان، بەشێوەیەک شانازی بەوە دەکرێت، کە کوردیەکەی منداڵەکانیان باش نیە!!!. پیم واینە هیچ نەتەوەیەک هیندەی باشوور لەو قۆناغەدا سووکایەتی بەزمانی خۆی کردبێت، بەپێچەوانەوەی رۆژهەلات و باکووری کوردستان، کە سەرباری ئەو فشارە زۆرەی خراوەتە سەر زمانی کوردی و هەوڵی سڕینەوەی دەدرێت، بایەخێکی ئێجگار زۆر بە زمانی کوردی دەدرێت و بەدڵسۆزیەوە دەستیپێوەگیراوەو دەپارێزرێت، ئەگەر ئەوەی لە باکووری کوردستان لەماوەی سەد ساڵی رابردوو بەرامبەر کوردو زمانی کوردی کراوە لەباشوور روویبدابوایە، بێگومان ئێستا شتێک نەدەما بەناوی زمانی کوردی، جێگای داخە لەماوەی سی ساڵی دەسەڵاتی بەناو کوردی هەرێمی کوردستان بۆتە گۆڕستانێکی گەورەی زمان و کەلتوورو بەها نەتەوەیی و مرۆییەکانی کوردی. چونکە ئێستا لەباشووری کوردستان بێبەهاترین زمان زمانی کوردیە، تەنانەت پێگە ئەکادیمیەکانیش، کە ئەرکیان پاراستن و پێشخستنی زمانی کوردیە،

بەچاوێکی سووک سەیری زمانی کوردی دەکەن، ئەو بەناو ئەکادیمیستانەی دوو دێری عەرەبی نازانن بەراستی بخوێننەوە توێژینەوەکانیان بەزمانی عەرەبی دەنووسن، سەیر لەوەدایە ئەگەر بەزمانی کوردیشت نووسیبێت هەندێکجار پێت وەردەگێڕنە سەر زمانی عەرەبی یاخود زمانێکی تری بێگانە، ئەمە لەگەڵ خۆم روویداوە، کاتێک داوای بەرزکردنەوەی پلەی زانستیم کرد بۆ پلەی پڕۆفیسۆری هەموو ئەو توێژینەوانەی بەزمانی کوردی نووسیبووم پێیان وەرگێڕامە سەر زمانی عەرەبی، دوو بژاردەیان خستە بەردەمم یا دەبێت وەریانگێڕمە سەر زمانی عەرەبی یاخود ئینگلیزی!. بەراستی ئەکادیمیاکانی کوردستان لەهەموو کایەکانی تر زیاتر زمانی کوردیان تێکداوەو سووکیان کردووە، تەنانەت ئەکادیمیای کوردی، کە ئەرکی سەرەکی خزمەتکردنی زمان و رۆشنبیری کوردیە، ئەو کتێبانەی بەزمانی عەرەبی چاپیکردوون و چاپیان دەکات زۆر زیاترە لەوانەی بەزمانی کوردی بڵاودەکرێنەوە.

کەواتە لەرۆژی زمانی کوردیدا دەبێت وەک زۆربەی کایەکانی تری کۆمەڵگای کوردی دەبێت هەناسەیەکی سارد هەڵبکێشین و خۆزگە بەو رۆژانە بخوازین، کە لەپێناو پاراستنی کوردبوونماندا شەڕمان بۆ پاراستنی زمانی کوردی دەکرد، تاکە ئومێدمان بۆ پاراستنی زمانی کوردی لەو رۆژە ئەنگوستە چاوەدا، تەنیا خەڵکە هەژارو نەخوێندەوەراو جووتیارو گوندنشینە سادەکانی کوردستانە، بۆیە لەم رۆەدا پیرۆزبایی لەوانە دەکەم و پێیان دەڵێم ئێوە هەرچۆنێک بژین، کۆڵەکەی مانەوەو زمان و کەلتووری کوردین، هەموو رۆژەکانتان پیرۆز بێت، لەبەرئەوەی هەموو رۆژەکان لای ئێوە رۆژی زمانی کوردیە.

## هوشیاری خۆپارێزی

## لەپێناو کەس نا لەپێناو مانەوەی خۆمان

2021\2\24

ئەو دۆخەی کوردستان ڕووبەڕووبووی دەبێتەوە، بەهۆی گەورەیی هەڕەشەکان و سنووورداری تواناکنی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هەڕەشانە، ڕەنگ بێت یەکێک لەکاریگەرترین ئەو چەکانەی لەبەردەست تاکی کوردایە بۆ خۆپارێزی هوشیاربوونەوەو بەرزرکردنەوەی ئاستی رۆشنبیریە. ئەو شەڕەی ئەمڕۆ لەجیهان بەڕێوە دەچێت، پێویستی بەتاکێکی هوشیار هەیە بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی بێتەوە، ناکرێت کەمو کوڕیە رۆشنبیریەکان بخەینە سەر حکومەت و دەزگاکان و هەمیشە هەڵەکانی خۆمان بخەنە ئەستۆی خەڵکانی ترەوە. گریمانی ئەوە بکەن، کە حکومەت نیە، بەڵام ئایا کاتێک حکومەت لەئاستی بەرپرسیاریەتیدا نەبیت، دەبێت هاوڵاتیان دەستبەرداری خۆیان بن و بێباکانە چارەنووسی خۆیان بدەنە دەست نەزانی و ناهوشیاریەوە!؟

ئێستا کێشەی کۆڕۆنا بۆتە یەکیک لەکێشە گەورەکانی جیهان و هەموو دەولەتیک هەوڵدەدات ڕووبەڕووی بێتەوە یاخود خۆی بۆ روبەڕووبوونەوەی ئامادە دەکات و هەوڵدەدات باشترین ڤاکسین بۆ هاوڵاتیەکانی دابین بکات. بەڵام لەکوردستان بەشێوەیەیکی گشتی ئەو توانایە لەئارادانیە، پاشان لە کۆڕۆنا مەترسیدارتر بۆ گەلی کورد لەهەموو

پارچەکان ئەو شەڕە بایۆلۆژیەیە، کە بەرامبەری پیادە دەکرێت، بازاڕەکانی کوردستان بۆتە جێگای ساخکردنەوەی کە ل و پەل و دەرمان و خۆراکی بەسەرچوو و بارگاویکراو بەچەندین نەخۆشی، ئەمە نەک بەتەنیا لە باشووری کوردستان بەلکو لەهەموو پارچەکانی کوردستان، بەلاّم رەنگ بیت لە باشووری کوردستان لەپارچەکانی تر زەقتر بێت!. خەریکە کۆمەڵگای کوردی دەبیتە کۆمەلگایەکی بە واتای وشە نەخۆش. کۆمەڵگایەکی تەوەزەل، کە خوانەکەی لەلایەن دوژمنەکانیەوە بۆ ئامادە دەکرێت. چ لەوە سەیرتر هەیە تۆ دڵینا بی، کە دەوڵەتەکانی دەوروبەرت هەولّی سڕینەوەت دەدەن و شەڕێکی بایۆلۆژی و لەناوچوونت لەگەڵ دەکەن، کەچی کاتێک لەسەر خوانەکەت دادەنیشیت چاوت هەموو ئەو ژەهرانە نەبینیت، کە بەناوی خۆراکەوە لەسەر خوانەکەت دانراوە!. بەراستی تاکە رێگایەک لە ئێستادا، کە لەهەموو رێگاکانی تر کاریگەرترە، هوشیاربوونەوەی خەڵکە، تاکی کورد پیویستە بایکۆتی کالاّکانی تورکیاو ئێران بکات، نەک وەک هەڵوێستێکی سیاسی، بەڵکو بەلایەنی کەم وەک هەڵوێستێکی خۆپارێزی، خوێنەری بەڕێز شتەکانی خۆماڵی بەکاربێنن، ئەگەر کەمێک گرانتریش بێت، کەمتر بەکاریبێنن باشترە لەو خواردنی ئەو ژەهرەی لەلایەن دوژمنانەوە لەژێر ناونیشان و وینەی جیاجیادا بۆمان دەنێرن، ئێوە هەست ناکەن ئێستا لە هەرێمی کوردستان باشترین کار بۆتە چێشتحانەوە نەخۆشخانە؟ کەواتە ئیمە گەلێکین تەنیا فێری خواردن کراوین و نازانین کاربکەین، ئایا لەخۆمان نەپرسیوە بۆچی کارکردنمان لا ناشیرین کراوەو خەلک فێری تەوەزەلی کراوە؟ ئایا تەوەزەلکردن بەشێک نیە لەشەڕێکی وجودی و بونیاتی لەگەڵ مرۆڤی کورد!؟ ئایا کاتێک

کاری دەرمانخانەو نەخۆشخانەکان باش دەبێت، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت ئێمە گەلێکی نەخۆشین و لەشەڕێکی بایۆلۆژی مەترسیداردایین!؟. باشە ئێمە چۆن دەتوانین رووهبەڕووی کۆڕۆنا ببینەوە، ئەگەر خۆمان نەپارێزین!؟، ئێمە چۆن دەتوانین بەر بەپیلانەکانی دوژمنان بگرین ئەگەر پشت بەخۆمان نەبەستین و خوانی خۆمان نەدەینە دەست دوژمنان!. بۆچی هەوڵدەدرێت بەرهەمی خۆمالی ریسوا بکرێت، ژەهری دوژمنانیش پڕوپاگەندەی بۆ بکرێت و لەبەرگی رازاوەو نەخشێنراوەوە بهێنرێتە بەردەمما!؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە لەخۆمان بپرسین بۆچی رۆژانە گەنج و پیرو منداڵەکانی دەوروبەرمان کت و پڕ نەخۆشی سەیر سەیر دەگرن و لەپڕێکدا کۆچی دوایی دەکەن و لەبەرچاو ون دەبن!؟ ئایا ناتوانین بیر لەوە بکەینەوە بۆچی رێژەی هەموو نەخۆشیە ترسناکەکان لەکوردستان بەرەو هەڵکشانە!؟

ئەگەر تا ئێستا نەمانپرسیبێت کاتی ئەوە هاتووە ئێستا فێربین پرسیاری جدی لەخۆمان بکەین، لەبەرخاتری کەس نا بەڵکو لەبەرخاتری مانەوەی خۆمان و خێزانەکانمان، پێویستە خۆمان هوشیار بکەینەوەو رۆژانە چاوێک بە خوانی ماڵەکانمان دابخشێنینەوە، با لەناخەوە لەپیناو ئەوەی بمێنینەوە پشت بەخۆمان ببەستین، کاتی ئەوە هاتووە بەرپرسیارانەتر سەیری دۆخەکە بکەین، لەپیناو کەس نا تەنیا لەپیناو پاراستن و مانەوەی خۆمان!.

## شەڕی گارە و تێکشکاندنی ئیرادەی سوپای تورکیا

2021\2\28

لەو رۆژانەدا زۆر رووداوی مێژوویی گرنگ روودەدەن، کەچی بەداخەوە میدیاکانی کوردی بەشێوەیەکی گشتی لەئاستی ئەو رووداوانە نین، بەتایبەتیش میدیاکانی باشوور، کە زۆرینەیان پابەندی حزبەکانن و بەرژەوەندی تەسکی حیزبەکانیان ریگایان پینادات راستیەکان بدرێکن، ئەمە جگە لەوەی هەژموونی دەوڵەتانی هاوسێ لەباشوور هێندە زۆربووە، کە سانسۆرێکی گەورەی لەسەر هەموو کایەکان، لەوانەش میدیاکانی هەریم دروست کردووە، ئەمە سەرباری ئەوەی ئاستی هوشیاری رۆژنامەنووسانی کورد بەداخەوە لەئاستی پێویست و گەورەیی رووداوەکان نیەو زیاتر خەریکی شەڕە دندوکی ناوەخۆن.

لە بەرەبەیانی 10 ئەو مانگەدا، دوای ماوەیەک لەهەڕەشە و چاوسوورکردنەوە، هیزەکانی تورکیا پەلاماری چیای گارەیان دا و هێرشیان کردە سەر بنکەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، هەموو پێشبینەکان بەو ئاڕاستەیە بوو، کە ئەو شەڕە زۆر دەخایەنێت و سەرکەوتنی گەورە بەدەستدێنێت، چونکە لەرووی چەک و تفاقی جەنگیەوە هیچ بەراوردێک لەنێوان هێزی تورکیاو هێزی گەریلاکان ناکرێت، ئەمە سەرباری ئەوەی لەناوەخۆو دەرەوە لەرووی سیاسیەوە پاڵپشتی تورکیا دەکرێت و گڵۆپی سەوزی بۆ لەناوبردن و سڕینەوەی

PKK ی بۆ دادەگیرسێنرێت. بەڵام دوای تەنیا چوار رۆژ، واتە لە 13 هەمان مانگدا تورکیا هەواڵی وەستاندنی شەڕی راگەیاندو بە بێدەنگی هێزەکانی خۆی کشاندەوە.

لەراستیدا تورکیا هێزەکانی نەکێشایەوەو وەک رایانگەیاند ئەرکەکەیان تەواو نەکردبوو، بەڵکو تورکیا رووبەڕووی شکستێکی گەورە بووەو وەک دەڵێن سەری دای لەبەردی چیای گارە. ئەوەی لەو شەڕەدا کەمتر هەڵوەستەی لەسەر کرا، چەند گەریلایەک نەک توانیان سوپای تورکیا بووەستێنن بەڵکو زۆر بەخراپی تێکبشکینن و زۆربەی ئەو ئەفسەرانەی بەشێوەیەکی مەیدانی سەرپەرشتی شەڕەکەیان دەکرد، زۆر بەخێرایی لەناوبران و کوژران، کە ئەمە ئیرادەی سوپای تورکیای بەتەواوی تیکشکاندو توانای بەردەوامکردنی شەڕەکەی لانەهێشت، ژمارەی کوژراوەکانی تورکیا زۆر زیاترە لەوەی هەردوولا باسی دەکەن، لەراستی پارتی کریکارانی کوردستانیش لەبەر نەوروروژاندنی رای گشتی تورکیا ژمارەی زۆری کوژراوەکانی سوپای تورکیا راناگەیەنێت، واتە جۆرە رێکەوتنێکی رانەگەیەنراو لەلاەین PKK و حکومەتی تورکیا هەیە، کە راستی ژمارەی کوژراوەکانی تورکیا رانەگەیەنن، یاخود PKK رایناگەیەنێت و تورکیاش خۆی لێبێدەنگ دەکات!.

وەک لەسەر زاری بەرپرسێکی PKK هاتووە ، نزیکەی بیست فڕۆکەی بێفڕۆکەوان و 41 فڕۆکەی شەڕکەرو سەدان سەربازو هێزی تایبەتی تورکیا بەشداری ئەو شەڕەیان کرد، بەشداریکردنی ئەو ژمارە زۆرە لەفڕۆکە واتای گەورەیی شەڕەکەو ترسناکی ستراتیژی تورکیا بووە لەو شەڕە، کە پێموایە هەوڵیکی شکستخواردووی تورکیا بوو بۆ

فراوانکردنی قووڵایی ئەو پشتێنە ئاسایشەی لەرۆژئاوای کوردستانەوە دەستیپێکردووە تا دەگاتە دوا خاڵی هەژموونی تورکیا لە ئێراق، واتە زینی وەرتێ، بەڵام ئەو هەوڵە شکستی هێنا، ئەنجامدانی شەڕێک بەرامبەر هێزیکی لەو جۆرە و شکاندنی هێرشیکی لەو شێوەیە رەنگدانەوەی دوو خاڵی گرنگە:

1- بوونی ئیرادەیەکی پۆڵایین و گیانێکی بەرەنگاربوونەوەی لەبن نەهاتوو.
2- ئاستێکی بەرزی شەڕی پارتیزانی، بەشێوەیەک دووەم گەورەترین هێزی ناتۆ نەتوانیت بەرامبەری بوەستێت!.

تورکیا لەو شەڕەدا هەموو جۆرە چەکیکی بەکارهێناوە، وەک لەراگەیەنراوە سەربازیەکەی PKK داهتووە، سوپای تورکیا بەچەکی کیمیاوی هێرشی کردۆتە سەرئەو ئەشکەوتەی، ژمارەیەک لەدیلەکانی تورکیای تیابووە، کە بەگوێرەی هەمان بەیاننامە ژمارەیان 13 کەس بووە، لەگەڵ گیراوێکی تری باشووری کوردستان و 6 گەریلای تیابووە، پاسەوانی دیلەکانیان کردووە، هەموویان کوشتووە پاشان بۆئەوەی شوێنەواری ئەو تاوانە بشارێتەوە، بەچەکی تر، واتە بەگولە لە جەستەی دیلەکوژراوەکانی داوە. ئەو شەڕە پێویستە سروشی لێوەربگیرێت و کورد لەهەموو پارچەکان وەک ئەزموونێکی بەرەنگاربوونەوە سوودی لیوەربگرێت، تەکنیک و تەکتیکی ئەو جۆرە شەڕانە پێویستە لە ئەکادیمیا سەربازیەکان بخوینرێت و گەنجانی کورد لەسەر ئەو بنەمایە پەروەردە بکرێن، هاوکات ئەمە ئەوەمان بۆ روونەکاتەوە، کە کورد چیتر ناکرێت بە بچووکیەوە سەیری خۆی

بکات و خۆی لەئاست دوژمناندا نزمتر ببینێت، ئەو شێوازە بەرگریە مۆدیلێکە پێویستە درێژەو پەرەی پێبدرێت، هیوادارم ئەو شکستەی تورکیا ببێتە هۆی ئەوەی چیتر بیر لەچارەسەری سەربازی بۆ مەسەلەی کورد نەکاتەوە و تورکیا و PKK بچنەوە سەر مێزی دانوستان، لەپێناو چارەسەریەکی رەواو ئاشتیانەی دۆزی کورد لەباکووری کوردستان، تورکیا لەجیاتی ئەوەی ئابووری وڵاتەکەی لەکوشتنی رۆڵەکانی خۆیدا بەهەدەر بدات، بۆ بونیاتنان و ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکەی بەکاریبهێنێت.

## عوسمانیە نوێیەکان و مەسەلەی کورد

ئەو وتارە بەشێوەیەکی تایبەت بۆ حیزبە ئیسلامیەکان و ئایندارەکانی کوردستان نووسراوە.

2021\2\28

هەست دەکەم لەکوردستان تێنەگەیشتنێک لە عوسمانیەکان و عوسمانیە نوێیەکان هەیە، ئەمە وایکردووە خەڵکانێک بەناوی ئاینداریەوە لایەنگری ئەردۆگان و ئاکپارتی بکەن، ئەمەش لەژێر رۆشنایی کاریگەربوونیان بەمێژووی دەوڵەتی عوسمانی، کە بۆ ماوەی نزیکەی پێنج سەدەی چەتری ئیسلامی (ئاینزای سوننە) ی وەک سۆفت پاوەرێک لەپێناو هێنانەدی بەرژەوەندیە ستراتیژیەکانی خۆی بەکارهێنا.

بۆئەوەی لەعوسمانیە نوێیەکان تێبگەین، دەبێت لە مێژووی دەوڵەتی عوسمانی تێبگەین و بەوردی خوێندنەوەی بۆ بکەین، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە مێژووی عوسمانیەکان بۆ سێ قۆناغ دابەش بکەین:

1- لە دامەزراندنیەوە (1299) تاوەکو (1517)، واتە تاوەکو داگیرکردنی زەویەکانی نەجدو حیجازو دەست بەسەرداگرتنی شوێنە پیرۆزەکانی ئیسلام.

2- قۆناغی دووەم لەساڵی (1517) وە دەستپێدەکات تاوەکو هاتنی مۆدێرنیتەو دەستپێکردنی ئەو قۆناغەی، کە لەمێژووی دەوڵەتی عوسمانی بە قۆناغی چاکسازی دەناسرێت و لەسەردەمی سوڵتان مستەفای سێیەم (1717-1774).

3- قۆناغی سێیەم لەسەردەمی چاکسازیەکان (مستەفای سێیەم -1717-1774). دەستپێدەکات و بەرووخانی دەوڵەتی عوسمانی بەکۆتا دێت.

هێندەی پەیوەندی بەو شرۆڤە کردنەی ئێمەوە هەیە، هەردوو قۆناغی دووەم و سێیەمە، کە دوو قۆناغی تەواو لەیەکتر جیاوازن و تەنانەت پێچەوانەی

یەکترن. لەقۆناغی یەکەمدا عوسمانیەکان بەهێزبوون و خاوەنی ئیرادەی خۆیان بوون، بەتەواوی لەژێر کاریگەری ئیسلام و کەلتووری رۆژهەڵاتیدا بوون، تەنانەت دەتوانین بڵێین دەوڵەتی عوسمانی یەکێک بوو لە ئیمپراتۆریاو زلهێزەکانی ئەو قۆناغە. هەرچی لە قۆناغی سێیەمدایە عوسمانیەکان دەکەونە ژێر هەژموونی رۆژئاواو وردە وردە لە پرەنسیپەکانی ئاینی ئیسلام دوور دەکەونەوەو ئیرادەیان لەلایەن وڵاتە رۆژئاواییەکانەوە، بەتایبەتیش فەرەنسی و بەپلەی یەکەمیش بەریتانیەکان کۆنترۆڵ دەکرێت، لەم قۆناغە مەسەلەی راسیزم و ناسیونالیستی توندڕەو لەئەورووپاوە لەژێر چەتری چاکسازی و دڵبەندبوون بەرۆژئاواوە دەگوازرێتەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانی و لەجیاتی تەبایی و بەیەکەوە ژیان دوژمنداری دەخاتە نێو تورک و هەموو ئەو نەتەوانەی پێشتر شان بەشانی عوسمانیەکان بۆ سەرکەوتنی ئیسلام هەوڵیاندەدا. ئەم قۆناغە درێژە دەکێشێت تاوەکو لە دواجاردا بەهۆی شکستی لە جەنگی یەکەمی جیهانیەوە دەوڵەتی عوسمانی هەڵدەوەشێتەوەو تورکیای کەمالی جێگای دەگرێتەوە، کە درێژەپێدەرو تەواوکەری قۆناغی دووەمی مێژووی دەوڵەتی عوسمانیە، واتە لەرەگەوە هەڵتەکاندنی کەلتووری موسڵمانی تورکیاو بەرۆژئاواییکردنی. عوسمانیە نوێیەکان نوێنەرایەتی قۆناغی دووەمی دەوڵەتی عوسمانی دەکەن و هیچ پەیوەندیان بە دەوڵەتە عوسمانیە رەسەنەکەوە نیە، کە لەیادەوەری مێژوویی موسڵمان و ئاینداراني کوردستان دەژیت. ئەوان دەیانەوێت تورکیا لەسەر بنەمایەکی تێکەڵەی ئاینی – ئەتنیکی - ناسیونالیستی دابڕێژنەوە. بۆیە دەبینین لەناو هەموو حیزبەکانی تورکیا، ئاکپارتی لەگەڵ مەهەپە هاوپەیمانی کردووە، کە یەکێکە نەک لەحیزبە نەتەوەییە توندڕەوەکان، بەڵکو یەکێکە لەحیزبە راسیستەکانی تورکیا.

خاوەنی راستەقینەی تێزی عوسمانیە نوێیەکان سەرۆک وەزیرانی پێشووتری تورکیا (ئەحمەد داود ئۆغلۆو)ە، کە لەکتێبەکەیدا (قووڵایی ستراتیژی

– پێگەو رۆڵی تورکیا لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتی) ئاماژەی بەو بیرۆکەیە کردووە، عوسمانیە نوێیەکان لەسەر هەرسێ رەهەندی ئاینی – ئەتنیکی – مێژوویی جوگرافی بەندە. داود ئۆغلۆ لەو پرۆژەیەدا ئاماژە بەمافی کەلتووری و رۆشنبیری نەتەوەکان دەکات، بەڵام هەرگیز لەگەڵ دروستبوونی هیچ جۆرە قەوارەیەک و ئۆتۆنۆمیەک نیە بۆ ئەو نەتەوانەی لەژێر چەتری عوسمانیە نوێیەکان دەژین و ئەم جۆرە ئۆتۆنۆمیە بەمەترسی لەسەر یەکپارچەیی خاکی تورکیا دەزانێت، بۆیە ئەو پرۆسەی لەتورکیا بەپرۆسەی ئاشتی ناوزەد دەکرێت، لەژێر کاریگەری ئەو بیرۆکەیەی داود ئۆلۆدابوو نەک ئەردۆگان وەک بانگەشەی بۆ دەکرێت!.

دواتر ئەردۆگان لەم تێزە لایداو لە ناسیونالیستە تورکە توندڕەوەکان نزیک بووەوە، هەر بۆئەم مەبەستەش لەپەنای عوسمانیە نوێیەکانەوە کار لەسەر دامەزراندنی تورانی گەورە دەکات، واتە کۆکردنەوەی هەموو تورکەکان لەژێر یەک چەتردا، هەوڵەکانی تورکیا لەئاسیای ناوەڕاست و دامەزراندنی ئەنجومەنی دەوڵەتانی تورکزمان و خۆنیشاندانی وەک بەرگریکارێک لە ئیگۆرەکانی چین دەکەوێتە ئەو خانەیەوە، هەر ئەمەش بوو بووە هۆی ئەوەی خودی خاوەن تێزی عوسمانیە نوێیەکان (داودئۆغلۆوی) لە ئاکپارتی دەرکردو وەک دەزانین ئێستا داودئۆغلۆ حزبێکی تایبەت بەخۆی هەیەو ئۆپۆزسیۆنێکی سەرسەختی ئاکپارتیە. کەواتە باشترین ناسنامە بۆ هێڵی ئاکپارتی عوسمانیە نوێیەکان نیە، بەڵکو باشتر وایە بەکەمالیستە نوێیەکان بناسێنرێن، چونکە لەکەمال ئەتاتورک توندتر کار لەسەر رەهەندی شۆفینیزم و سڕینەوەی نەتەوەکانی تر دەکەن. بەڵام زۆر بەوریایی و زانایشەوە ئاینی ئیسلام لەپێناو ئەو مەبەستەی بەکاردەهێنن و لەمەشدا سەرکەوتنی گەورەیان بەدەستهێناوەو توانیویانە ژمارەیەکی زۆری موسڵمانانی سوننەی جیهان فریوبدەن، بەداخەوە لەنێو ئەوانەش موسڵمانانی کوردە، بۆیە زۆر گرنگە پیاوانی ئاینی و

ئاینداره‌کان و حیزبه ئیسلامیه‌کانی کوردستان له‌و مه‌ترسیه تێبگه‌ن و ئه‌وانیش هه‌وڵبده‌ن سوود له‌ئاینی ئیسلام وه‌ربگرن له‌پێناو ئازادی و رزگارکردنی میلله‌ته‌کی خۆیان، نه‌ک فریو بدرێن و بۆ خزمه‌تی ده‌وڵه‌تێکی ناسیونالیستی توندڕه‌و له‌په‌نای ئاینه‌وه خزمه‌ت به ئه‌جێندا مه‌ترسیداره‌کانی رۆژئاوا بکه‌ن!.

# زمانی کوردی

2021\3\6

بۆئەوەی زمانی منداڵەکانتان پاراو بێت پێویستە فێریان بکەن بگەڕێنەوە بۆ فۆلکلۆر، بە پلەی یەکەم گوێ لە پەندو لاوک و داستانەکانی کوردی بگرن، دوای ئەوەش چیرۆک و رۆمان و شیعری کوردی بخوێننەوە، بۆئەوەی فێری بیرکردنەوەش بن، هانیان بدەن خۆیان بخەنە دەرەوەی بابەتە ئەدەبیەکان بایەخ بە بابەتە فەلسەفەکان بدەن، بۆئەوەی کار بۆ پێشکەوتنی وڵاتەکەیان بکەن، دەستیان بگرن بۆئەوەی بایەخ بە زانست و تەکنەلۆژیا بدەن، بۆئەوەی لەکێشەی میللەتەکەیان تێبگەن، بۆیان روونبکەنەوە، کە دەبێت تێگەیشتن لەمێژوو و ستراتیژیەت و جیۆپۆلەتێک و جیۆستراتیژیەت بە هەند وەرگرن و بزانن پیگەی ولاتەکەیان دەکەوێتە کوێی سیاسەتی نیودەوڵەتیەوە

## پوولێکت نەبێت پوولێک ناهێنیت!

2021\3\11

لەسەر پوولێک تورکیاو ئیران هاتنە سەر خەت، نەک بەتەنیا سووکەیەتیان بە میللەتی کوردو خاکی کوردستان کرد، بەڵکو سووکایەتیان بەهەموو پیرۆزیەکانی کوردستانیش کرد. باخچەلی گوتی خاکەکەتان لەژێر پێی ئیمەدایە، کەواتە ئاڵاکەشمان لەژێر پێی ئەواندایە، بەهاکان و زمان و رۆشنبیری و ناموس و کەرامەتی کورد لەژێر پێی ئەواندایە!. ئەوان ئەو هەموو پیرۆزیانەی ئێمە بە پوولێک هەتک دەکەن، کەچی ئێوە رۆڵەکانی خۆتان پێشکەشیان دەکەن و براکانی خۆتانیان بۆ دەکوژن!. ئێوە بەدەیان گەنجی کوردتان تەسلیم بەتورکیاو ئێران کردەوە، ئێوە بە هەزاران گەنجی کوردتان بۆ بەرژەوەندی تورکیاو ئێران کوشت و بەکوشتن دا، ئێوە نەوتی کوردستانتان بەتانکەرو بەبۆڕی و تەنانەت بەناولەپیش بۆ تورکیاو ئێران گواستەوە، ئێوە چی نەما بۆ تورکیاو ئیرانی نەکەن؟! کامە سیخوڕو جاسوسی تورک ئیران بە قەد ئێوە خزمەتی بەو دوو ولاتە کردبێت؟ کێیە هیندە ئیوە بۆ رازیکردنی دلی تورکیاو ئێران ئەوەی بیری لینەکرابێتەوە دژی میللەتەکەی خۆی کردبی!. ئێوە خاک و وڵات و گەل و سامانی سەر زەوی و ژێر زەویتان کردە قوربانی پێلاوەکانی تورک و فارس، خوینی گەنجەکانتان کردە شایاشی مەرحەبایەکی تورک و فارس، کەچی ئەوان پولێکتان پێڕەوا نابینن، ئێوە

کە گەلتان لەدەستدا، واتە پوولێکتان نەما، کورد لەمێژە گوتویەتی ئەوەی پوولێکی نەبیت پوولێک ناهێنیت

## پێویستە گەورەتر بیر بکەینەوە

2021\3\12

ئالنگاری گەورە میللەتی زیندوو هوشیار دەکاتەوە نەک لاوازی دەکات، بەپێچەوانەوە میللەتی نوستوو هەزار نوقورچەشی لیبدەی واگا نایەت!. ئێستا کورد لەبەردەم دوو ریانێکدایە، ئەگەر نەتوانێت بیسەلمێنیت میلەەتەیکی زیندووە، ئەوە زیاتر لە زەلکاوەکانی مێژوو رۆدەچێت، وەک هزرمەندی ئینگلیزیش (ئەرنۆڵد تۆینبی) دەڵێت، ئەگەر هاتوو وەلامی مبللەتان بەقەد ئئەو ئالنگاریە بوو، کە رووبەروی دەبنەوە، دەتوانن سەر بەرز بکەنەوەو شارستانیەتی خۆیان دابمەزرێنن، ئەگەریش نا دەکەونە ژێر پێی ئالنگاریەکەو شانۆی ژیان جێدەهێڵن، واتە بەرەو توانەوەو لەناوچوون دەچن.

ئێستا کورد لەهەموو لایەکەوە رووبەڕووی ئالنگاری، تەنانەت سووکایەتی پێکردنیش بۆتەوە، بەشیوەیەک هیچ میللەتێکی زیندوو ئەو دۆخە قبووڵ ناکات!. راستە چەندین ساڵە کار لەسەر سڕکردن و بێبەهاکردنی دەکرێت، بەڵام هێشتا توانای بەرەنگاربوونەوەو وەلامدانەوەی ئالنگارییەکانی زۆرەو دەرفەتی ئەوەی لەبەردەمە خۆی بینا بکاتەوەو شارستانی خۆی دابمەزرێنێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە بەر لەهەموو شتیک پیویستی بەوە هەیە خۆی لە گەڕەلاوژەی پارتی و یەکێتی رزگار بکات چیتر خۆی بەوانەوە خەریک نەکات، چونکە ئەوانە قۆناغی

مێژووییيان تەواو بووەو لەوە زیاتریان پێنیە، دەبێت ئەو قۆناغە زورهان و دووبارە بووەوە  تێپەڕێنین و بەئاڕاستەیەکی تر بیر بکەینەوە، کە ئاڕاستەی خۆدۆزینەوەو رزگاربوون و بونیاتنان بێت.

ئەوەی تورکیاو ئێران لەو ماوەیە بەرامبەر کوردی دەکەن، لەمێژوودا وێنەی زۆر کەم بووە، بە هەموو شێوەیەک هەوڵی لەناوبردن و سڕینەوەی دەدەن، کوردیش لەپەنای هەستیاری دۆخەکە بەردەوام وەکو سیاسەتی قەلەکە سەری خۆی خستۆتە ژێر بەردەکەو دواوەشی لەدەرەوەیە، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە، کە دلێرانەتر رووبەڕووی ئەو داگیرکاری و سووکایەتی پێکردنە بێتەوە، بێدەنگ بوون بەو ئاستەی ملکەچیە، بە تایبەتی لەباشوور دەرگا کردنەوەیە بەڕووی مەرگ و شکستی بەردەوام، ئەگەر لەو نێو ئەو گۆڕانکاریە گەورانەی ئێستا لە هاوسەنگی هێزو سیاسەتی دونیا دەگوزەرێت نەتوانێت جێپێیەک بۆ خۆی بکاتەوە، ئەوا هەرگیز ئەو دەرفەتە دووبارە نابێتەوە. ناکرێت بەقسەی ئەمریکاو رۆژئاواییەکان بکەین و بەو بێئیرادەییە سیاسەت بکەین، ئەوان نەک نایانەوێت کێشەکەی ئێمە چارەسەر بکەن، بەڵکو ئەوان هۆی راستەقینەی کێشەکانن و زیاتر لە یەک سەدەیە وەبەرهێنانی لەسەر دەکەن. هێزی ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان داگیر کردووە لەوانەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەگەر دوو رۆژ ئەمریکاو ئەوروپا یارمەتی تورکیا نەدەن، تورکیا بۆیەک رۆژیش خۆی ناگرێت. ئەوە چەکی ئەمریکی و ئەڵمانی و ئەوروپیە دەدرێتە تورکیا بۆئەوەی کوردی پێبکوژێت. فڕۆکەکانی ناتۆیە شارەکانی کوردستان لەباشوورو رۆژئاوای کوردستان بۆردومان دەکات، ئەوە ئەمریکاو ناتۆ بوون گڵۆپی سەوزیان

بۆ توركیا دایساند بۆئەوەی عەفرین سوتماك بكات و بەچەكی فسفۆڕ لەسەرێكانی و گرێسپی بدات، ئەوە لەژێر چاودێری و گڵۆپی سەوزی ئەمریكاو ناتۆدایە فڕۆكەكانی توركیا لە ناو شارەكانی هەرێمی كوردستان كێیان گەرەک بێت بە رۆژی رووناک تیرۆری دەكەن!.

كاتی ئەوە هاتووە كورد بۆناوماڵی خۆی بگەڕێتەوە، لەجیاتی ئەوەی كارلەسەر یەكتر بكەن و یەكتر بفرۆشنە ئەم و ئەو واباشترە كار لەگەڵ یەكتر بكەن، كاتی ئەوە هاتووە رۆشنبیرو خەمخۆرانی ئەو وڵاتە لەچوارچێوەیەكی فراوانتر لەیەكێتی و پارتی و لەسەر بنەمایەكی نیشتمانی رووبەڕووی ئەو سووكایەتی و ئالنگاریە گەوررانە ببنەوە، كە لەلایەن داگیركەرانی كوردستانەوە ئاڕاستەیان دەكرێت، دەبێت وەک پەرچەكردارێک بەرامبەر هەڵوێستی داگیركەرانی كوردستان، كورد بەگوڕتر ناوماڵی خۆی یەكبخات، چونكە لەمێژە گوتراوە، سەد ساڵ بكەی بێگانە پەرستی لەدوایدا هەردێنی نوشوستی!.

## کێن دۆستە راستەقینەکانی کورد؟

2021\3\28

جێگای سەرسوڕمانە، کورد تاوەکو ئێستا زۆر بەساویلکەیی لە سیاسەت دەڕوانێت و بەنووکە قەڵەمێک وەک دەڵێن دۆست و دوژمنی خۆی دەست نیشان دەکات، لەکاتێکدا بە هەموو پێوەرەکان تا ئێستا دۆست و دوژمنی خۆی ناناسێنت و هەر رۆژەی هێزیک لەپیناو بەرژەوەندیەکانی خۆی بەکاریدێنێت، دوای ئەوەی کاری پێی نامێنیت وەکو دەستەسڕێکی پیس فڕێی دەدات!. لەراستیدا ئەمە ئەو شەرمەزاریە گەورەیەیە، کە پێویستە هەموو تاکی کورد هەستی پێبکات و منداڵەکانی لەقوتابخانەکان لەسەری پەروەردە بکرێت، بۆئەوەی هەر هیچ نەبێت، ئەگەر کورد نەتوانێت بگاتە ئامانجە ستراتیژیەکانیشی، بتوانێت خۆی لە کارەساتی ئەو شەرمەزاری و ریسوابوون و بە دەستەسڕ بوونە بپارێزێت.

ئەمریکا دۆستی کوردە، کورد هەموو هیوایەکی لەسەر ئەمریکا چنیوە بۆئەوەی لەدەست دڕندەکانی ئەو هەریمە رزگاریان بکات، کە هەر خۆی لەژێرەوە هانیان دەدات و چەکیان دەداتە دەست بۆئەوەی کورد بکوژن!. لەکاتێکدا دەیانەوێت وانیشانی کورد بدەن سیاسەتی بایدن قۆناغێکی نوێیەو پشتگیریەکانی ئەمریکا دەگەڕیتەوە بۆ کوردو بەپرسەکانی لە رۆژئاوای کوردستان لە ژێر وێنەی ئۆجەلان وێنە دەگرن،

که خۆیان خستوویانەتە لیستی تیرۆرەوە، لە هەمانکاتدا بەناوبانگترین میدیای ئەمریکی (نیۆیۆرک تایمز) پەسنی ئەردۆگان دەکات و بەرزگارکەری عەفرینی لەقەڵەم دەدات، ئەو ئەردۆگانەی رۆژانە ژن و منداڵ و گەنج و پیری کورد دەکوژێت، وەک پەیامبەرێکی ئاشتی و رزگارکەری خەڵکی عەفرین لە دەستی سوپای دڕندەی رژێمی ئەسەد نیشانی دنیای دەدات، لەکاتێکدا هەمووومان دەزانین عەفرین لەدەست رژێمی سوریا نەبوو و ئارامترین ناوچەی سوریا بوو، سەرباری ئەمەش ئەو رژێمەی لەو شارە پیادە کرا، هەموو خەڵک بەشداری دەسەلاتی دەکردو بەیەکەوە شارەکەیان بەجوانترین شێوە بەڕێوە دەبرد، ئێستاش دوای ئەوەی تورکیا داگیری کردووە، نەک رۆژانە ژن و منداڵانی کورد دەکوژێت و لەخاکی خۆیان دەریان دەکات، بگرە دار زەیتوونەکانی عەفرینیش، کە نیشانەی ئاشتی و ژیانە لە رەگەوە هەڵدەتەکێنێت و سووتماکی دەکات!. ئەوە ئەو ئەمریکایەیە، کە کورد بە دۆستی خۆی تێدەگات. فەرەنسا، لەکاتێکدا خۆی بەسەرچاوەی دیموکراسیەت و فەرمانرەوایی گەل دەزانێت و لەکاتی هێرشی تورکیا بۆ سەر گرێسپی و سەریکانی فرمێسکی تیمساحی بوو کورد دەڕشت و هاوکات لەلایەکی تر وەک دەولەتێکی ئەندام لە ناتۆ هاریکاری تورکیای دەکرد بۆ سووتاندنی رۆژئاوای کوردستان!. لەگەمژەیی کوردیش ماوەیەک بوو میدیاکانی کوردی بە پشت و پەنای کورد نیشان دەداو سەرۆکەکانیان بە دایکی کوردان یاخود باوکی کوردان ناوزەد دەکرد، کەچی لە پڕێکا بۆ رازیکردنی دوژمنە ساختەکەی، کەوتە راوەدوونانی کوردانی ئازادیخوازو یانەو سەنتەرە رۆشنبیریەکانی کورد لە شارەکانی ولاتەکەی

دادەخات!. کەواتە نە نەوەکانی دایکی کوردان و نەنەوەکانی باوکی کوردان راستگۆ دەرچوون شێربوون لەپێستی رێویدا!. ئەڵمانیا، لەکاتێکدا دەیەوێت سەرکردایەتی یەکێتی ئەوروپا بکات و باس لە ئازادی و دیموکراسی و مافی مرۆڤ دەکات، بۆمب و تانکەکانی دەداتە تورکیا بۆئەوەی گەلی کوردی پێ رەشەکوژ بکات!. سیخوڕەکانی ئەڵمانیا لەو ناوچەیە زانیاری کۆدەکەنەوەو دەیدەنە دەست دەزگا هەواڵگرییەکانی تورکیا!.

بەداخەوە ئەوانەی کورد وەک دۆستیک تەماشایان دەکات و بەفریادڕەسیان دادەنێت، بچووکترین رێژەی ئاکاریان نیەو تیرە ماریکی ژاراوین و لەنزیکترین دەرفەتدا پێیوەدەدەن. بەراستی کاتی ئەوە هاتووە، کە واز لەو ململانێیە بێواتاو سووکەی ناوخۆیی بهێنرێت و لەرۆچنەیەکی ترەوە سەیری ژیان و دوا رۆژ بکرێت. من دەزانم ئەوە کاریکی ئاسان نیەو تەنانەت ئەو شەڕانەش، کە بەشەڕی ناوخۆیی کوردی دەناسێنرێت، دەستە ئەو دۆستە دڵسۆزانەی کوردی تیایە، بەڵام بەلایەنی کەم پێویستە کورد تاکی کورد بۆ جارێکیش بێت بەشیوەیەکی ئاوەزمەندانە بیربکاتەوە راستیەکان بەو شیوەیە ببینیت، کە هەیە نەک وەک ئەوەی ئەو دۆستانەی نیشانی دەدەن!. کاتی ئەوە هاتووە کورد هەوڵبدات بە پەیوەندیەکانی لەگەڵ دەرو دراوسێ و ئەو گەل و نەتەوەو ولاتانە دابچێتەوە، کە مێژوویەکیان بەیەکەوە هەیە. راستە ئەوانیش بەشێکن لەو گەمە قێزەونەی رۆژئاوا، بەڵام هەرچۆنێک بێت دەتوانێت وەک شیرنترین تاڵەکان مامەلەیان لەگەڵدا بکات، ئەگینا ئەو رۆژئاواییانەی، کە فەیلەسووفی گەورەی ئەڵمانی نیچە ناوی ناون دڕندەی سۆری

چاوشین(الوحش الاشقر)، بەهیچ  شێوەیەک نەک هەر بەهانای کوردەوە نایەن، بەلکو ئەوان خۆیان هۆی هەموو ئەو نەهامەتیانەن، کە لەمێژووی نویدا بەسەر کورد داهاتووە. بۆیە دەبێت لەوە تێبگەین، کە باشترین دۆستی کورد تەنیا کورد خۆیەتی، ئەگەر هۆی نەبێتە دۆستی راستەقینەی خۆی، ئەوا ئەو دۆستانەی بە دۆستی راستەقینەیان تێدەگات، دەیانەوێت لەرگەوە هەڵیکەنن و لەمێژوودا بیسڕنەوە.

## کوردستان لە چاوەڕوانی گەمەیەکی ئاڵۆزو ترسناکدا!

2021\3\31

تەختەی شەترەنجی کوردستان لە ئێستادا چەند جوولەیەکی ترسناکی لەسەر دەگوزەرێت، لەلایەک بەیانی دوا مۆڵەتی سوپای ئێراق بۆ هێزەکانی پاراستنی شەنگال تەواو دەبێت، کە خەڵکەکەی بڕیاری مانەوەو بەرگریان داوە، لەلایەکی تر سەرۆکی هەرێم بانگهێشتی فەرەنسا کراو یەکێک لە بابەتەکانیان وەک لە کۆنگرە رۆژنامەنووسیەکەیدا ئاماژەی پێکرد سوریا بوو، کە دیارە مەبەستیان لە رۆژئاوای کوردستانە، لەبەرئەوەی شەنگال لەرووی ستراتیژیەوە کاریگەری لەسەر باشورو رۆژئاوای کوردستان هەیە، ئەو سەردانە لەکاتێکدایە، کە نزیکبوونەوەیەک لەنێوان تورکیاو فەرەنسا هاتۆتە ئاراو وەک دیارە فەرەنسا دەیەوێت بەلێدان و بچووککردنەوەی کورد دڵی تورکەکان رازی بکات!. بۆیە لەلایەک کەوتۆتە راوەدوونانی رۆشنبیران و نیشتمان پەروەرانی کورد لەوڵاتەکەی و لەلایەکیتر خەریکی چنینی تەونی پلانگێڕیەکە دژی کورد لە رۆژئاوای کوردستان، کە رەنگ بێت یەکێک لەئەگەرەکانی شەڕێکی تری کوردی کوردی بێت، بەشێوەیەکی وردتر شەڕێک لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و پارتی کرێکارانی کوردستان، کە ئەگەری ئەوەش هەیە یەکێتی و گۆڕان لەرووی سیاسی و سەربازیەوە لەو شەڕە تێوە بگلێن، بەتایبەتیش ئەگەر تورکیا رووێکیان بەروودا بکاتەوە. لەبەرئەوەی شەڕ لەشەنگال بەگوێرەی رێکەوتننامەی

هەولێرو بەغدا، واتە حکومەتەکەی کازمی بەڕێوە دەچێت، کە ئەمریکا پاڵپشتی دەکات، کە ئەمە وا دەکات ئەو هێزە شیعیانەی دژی ئەمریکان و هاوپەیمانی ئێرانن تەگلێنە ناو شەڕێکی لەم جۆرە، بەتایبەتیش ئەگەر زانیمان لە تێپەڕاندنی بۆجەی ئێراقیش ئەمرۆ رۆڵی ئەو هێزانە پەراوێز خراو پلانەکەی ئەمریکا سەریگرت (کورد + سونە+ بەشێک لەو شیعانەی، کە وەک شیعە ئێراقیەکان دەناسرێن) بۆجەی تێپەڕاندو هێزە گەورەکانی شیعە، کە نزیکن لەئێران وەک فەتح و دەوڵەتی و یاساو ... هتد، لەهاوکێشەکە خرانە دەرەوە، دیارە ئەمەش رێگا خۆش دەکات بۆئەوەی لە مەسەلەی شەنگال هەڵوێستێکی توندو پێچەوانەی سوپای ئێراقیان هەبێت، بە تایبەتی ئەگەر زانیمان ئەو هەنگاوە زیانێکی گەورە بەئێران دەگەیەنێت و رێگای گەیشتن بەسوریای لێ ئاڵۆزو سەختتر دەکات!. بۆیە ئەگەر حکومەتی ئێراقی جدی بێت لەو مۆڵەتەی بۆ دەرچوونی هێزەکانی پاراستنی شەنگال لە شەنگال دایناوە، ئەوە واتای ئەوەیە شەڕێکی هەرێمی ترسناک لەسەر خاکی هەرێمی کوردستان، بەتایبەتی ناوچەی زەرد دادەگیرسێت و ئەگەری زۆرە ئەو شەڕە فراوان بێت، لەبەرئەوەی یەکێک لەئەگەرەکان ئەوەیە تورکیا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کار بۆ درێژەپیدان و بەردەوامبوونی ئەو شەرە بدات، تا لەکۆتایی ناوچەکە دەخاتە ژێر کۆنترۆلی خۆیەوە، چونکە بەشێوەیەک لەشێوەکان ئەو شەڕە درێژکراوەی ئەو پلانەی تورکیایە، کە لەزستانی ئەمساڵەوە خۆی بۆ ئامادەکات، هەنگاوی یەکەم لەگارە شکستی هێناو دەیەوێت لە شەنگال قەرەبووی شکستەکەی بکاتەوە، لەلایەکتیریش کاتێک ئەو گەلە کۆمە دەکرێت، پارتی کرێکارانی کوردستانیش دەستەوەستان نابێت و رەنگ

بێت شەڕەکە بگوازێتەوە ناو شارەکانی ناوچەی زەرد، ئەو کاتە شەڕەکە بەتەنیا لەنێوان هێزە چەکدارەکان نامێنیتەوەو دەپەڕیتەوە ناو شارەکانیش. ئەگەری هەرە مەترسیداریش ئەوەیە شەڕەکە گەورەتر بێت و بکەوێتە نێوان هەردوو بەشی رۆژئاوا باشووری کوردستان، کە دیارە ئەمە پێشکەوتنێکی زۆر مەترسیدار دەبێت لەشەڕی ناوەخۆی کوردی و لو قۆناغە هەستیارەدا زیانێکی زۆر گەورە بە مەسەلەی کورد دەگەیەنێت.

ئەوەی دۆخەکە مەترسیدارتر دەکات، وا پێدەچێت جۆرە ریککەوتنیکیش لەمبارەیەوە لەگەڵ روسیا کرابێت، لەبەرئەوەی ماوەیەکە ئەمریکیەکان بە ئاشکرا رایدەگەینن، کە ئەوان چیتر بەتەنیا ناتوانن کاروباری جیهانی بەڕێوەبەرن وپێویستە روسیاش بە بەرپرسیارەتی جیهانی خۆی هەڵسێت، دیارە ئەمەش واتای گەڕانەوەیە بۆ پێش قۆناغی سیستەمی تاکجەمسەری، بە واتایەکی تر هەمدیس بوونەوەی کوردستانە بە ناوچەیەکی تامپیۆنی و دیسان کێشەکان لەسەر حیسابی بەرژەوەندی کورد چارەسەر دەکرێن، کە بەداخەوە ئەمە رێگا خۆش دەکات دوا پەردەش بەسەر ئەزموونی هەریمی کوردستانیش دابدرێتەوە. کەواتە ئەوەی نیگەرانیەکە زیاتر دەکات، ئەوەیە، کە زلهێزەکان دەیانەوێت لەسەر حیسابی مەسەلەی کورد سازش لەگەڵ تورکیا بکەن، چۆن روسیا گڵۆپی سەوزی بۆ داگیرکدنی عەفرین دایساندو ئێستا ئەمریکیەکانیش بە رزگارکردنی عەفرینی لەقەلەم دەدەن، لەکاتێکدا ئەوان خۆیان بە هاوپەیمانی یەکینەکانی پاراستنی کوردی نیشان دەدا، کە ئەو شارەی لەژێر دەستدابوو، بە هەمان شێوە ئەمجارەیان شەنگال بخەنەوە بەردەستی ئێراق و روسیاش گڵۆپی سەوزیان بۆ دابگیرسێنێت، کە دیارە

ئەم هەنگاوەش ئەگەر سەربگرێت دەبێتە هۆی بەهێزبوونەوەی ئێراق و بەشێوەیەک لەشێوەکان گەڕاندنەوەی هەنگاوێکی سەرەتاییە بۆ گەڕاندنەوەی ئێراق بۆ دۆخی بەر لەداگیر کردنی کوێت. کە بەداخەوە لە هەموو ئەو گۆڕانکاریانە وا پێدەچێت بەهۆی پەرتەوازەیی و نارێکی ناو ماڵیەوە کوردستان و کورد زەرەرمەندی یەکەم بێت. بۆیە دەبێت کورد لەهەموو پارچەکان گەورەترو قووڵتر سەیری ئەو هاوکێشە ئاڵۆزە بکات و ئیرادەی نیشتمانی خۆی بپارێزێت، چونکە ئەو بزمارەی ئەو جارەیان لە قەوارەی کوردی بدرێت، زۆر ترسناکترو کەمەر شکێنترە لەهەموو ئەوانەی پێشووتر.

## پیشەسازی دروستکردنی بنەماڵە سیاسیەکان!.

2021\4\6

باڵادەستی بنەماڵە سیاسیەکان، کێشەیەکی گەورەی ئەمڕۆی مرۆڤایەتیە، بەتایبەتی لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست و جیهانی سێیەم، زۆر لە وڵاتان بەدەست ئەو بنەماڵە سیاسیانەوە دەناڵێنن، کە خراوەتە کۆلێان و حەرام و حەلاڵی وڵاتەکەیان بۆ خۆیان حەلاڵ کردووەو ئێستاو رابردوو ئایندەی میللەتەکەیان خستۆتە مەترسیەوە.

کێن ئەو بنەماڵە سیاسیانە، ئەو دەسەلاتە لەکوێوە دەهێنن و کێن پاڵشتیان دەکەن و دەیانپارێزن؟ ئایا ئەوانە بۆ خزمەتی میللەتەکانیان هاتوون وەک نیشانی دەدەن، یاخود بەوەکالەوە پلانێکی تر جێبەجێدەکەن؟!

دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، بەریتانیەکان لەرێگای هاوسەنگی نێوان بنەماڵەکانی رۆژهەلاتەوە باڵادەستی و بەرژەوەندیەکانی خۆیان بپارێزن، ئەو بنەماڵانەی پێگەیەکی ئاینی، یاخود کۆمەلایەتین هەبوو، لێیان نزیک بوونەوەو هاوسەنگیەکیان لەنێوان دروستکردن، تەنانەت هەندێکجار لەکەسانی ئاسایی، تەنانەت لەکەسانی دزێوو مرۆڤ کوژو دزەکانی نێو کۆمەڵگاوە بنەماڵەیان دروستکردو مۆرکێکی سیاسیان پێبەخشین، میداکانیان بۆ خستنە گەڕو تاکەکانی کۆمەڵگەکەیان بەشێوەیەک بۆ گۆشکردن، کە ئەگەر ئەو بنەماڵانە نەبن، وڵاتەکانیان وێران دەبێت و جگە لەوانە کەس ناتوانێت و کەسی تر شایەنی ئەوە نیە حوکم بکات!.

بیرۆکەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لەرێگای هاوسەنگی نێوان هۆزەکانەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ژەنراڵی بەریتانی ساندمان، کە لە ئەفغانستانەوە کاری لەسەر دەکرد، بیرۆکەکەی ساندمان خۆی لە هێنانە پیشەوەی دیارترین سەرۆک هۆز یاخود کەسایەتی ئاینی دەدۆزیتەوە، بۆئەوەی هەموو هۆزەکانی تر لەرێگای ئەوەوە رام بکرێن و کۆنترۆڵ بکرێن. هەموو هۆزە بچووکەکان بۆ ئەوەی لە هەژموونی هۆزە گەورە بپارێزرێن، پێویستیان بە یارمەتی بەریتانیەکان دەبوو، هەرکاتێکیش ئەو هۆزە بچووکانە یەکیان گرتبوایە، ئەوا هۆزە گەورەکە پێویستی بەریتانیەکان دەبوو، ئەم هاوسەنگیە وایدەکرد هەردوو لا پیویستیان بە بەریتانیەکان بێت، بەم شێوەیە بەریتانیەکان سەقامگیری ناوچەکەیان دەپاراست و ستراتیژیەکانی خۆیان جێبەجێدەکرد، هەرکاتیکیش کاریان بەلایەکیان نەمابوایە، دەستیان لێبەردەدان و دەیانخستنە بەردەمی گورگەکان!.

بنەماڵە سیاسیەکانی کەنداوو وڵاتانی عەرەبی نمونەیەکی زەقی ئەو هاوسەنگیەن، ئال سەباح، ئال هەیان ... ئال سعود .... هتد، ئەمانە هەموو ئەو بنەماڵانەن، کە لەوڵاتانی عەرەبی بەرزکراونەتەوەو دەپارێزرێن، بۆ نمونە لە ساڵی (1945) ریکەوتنێک لەنێوان سەرۆکی ئەمریکاو ئال سعود بەسترا، ئەرکی ئال سعود ئەوەبوو، دەرگای بیرە نەوتەکانی وڵاتەکەی بۆیان بخاتە سەر پشت، ئەرکی ئەمریکاش پاراستنی ئەو بنەماڵەبوو لە هەڕەشە دەرەکی و ناوخۆییەکان، واتە لە مەترسی گەلەکانیان!. دیارە ئەو جۆرە رێککەوتنە لەگەڵ هەموو بنەماڵەکانی تر کراوە .

کەواتە هاتنی ئەو بنەماڵانە بۆ سەر کورسی دەسەڵات نەبەباش نەبەخراپ پەیوەندی بەویستی میللەتەکانیان نەبووە، ئەو ناوو نازناوانەی هەڵیانگرووە بەهیچ شێوەیەک پێگەی سیاسی و فەرمی ئەوان دەرنەبڕێت، بۆ نمونە کاتێک پێیان دەگوترێت شا، یاخود پادشای فڵانە وڵات، ئەوانە هیچ سیفەتێکی پادشایەتیان تێدا نەبووە، چونکە پادشای تێر نایەوێت فەرمانڕەوایی گەلێکی برسی بکات، کەچی ئەوانە زۆرینەی خەڵکی وڵاتەکانی خۆیان خستۆتە ژێر هێڵی هەژاری و برسیەتیەوە، تەنیا لەپێناو مانەوەی خۆیان و رازیکردنی گەورەکانیان!. بۆ نمونە لە دەوڵەتێکی دەوڵەمەندی وەکو سعودیە، ژمارەی ئەوانەی لەژێر هێڵی هەژاریدا دەژین لەنیوەی کۆمەڵگاکە زیاترە، کەچی چەندین هەزار شازادە بە ئارەزووی خۆیان یاری بە سامانی وڵات دەکەن و لەژیانێکی شاهانە دەژین.

دەسەڵاتی بنەماڵەی سیاسی لەمێژووی نوێی کورددا لەشێخ عوبەیدووللای نەهریەوە دەست پێدەکات، پێش شێخ عوبەیدوللا، واتە بەر لەوەی میرنشینە کوردیەکان بڕۆخێت، میرەکان فەرمانڕەواییان دەکرن، کە شیوازیکی فەرمانرەوایی بوو و مۆرکێکی رۆژهەلاتیان پێوەبوو مۆدیلی حوکڕانی ئەو کاتە بوو لای هەموو گەلانی ناوچەکە، بەڵام دوای ئەو قۆناغەو دوای ماوەیەک لەبۆشایی سیاسی لە کوردستان، شێخ عوبەیدوللأ وەک یەکەم شێخی تەریقەت لەکوردستان پێگە ئاینیەکەی خۆی بەکارهێنا بۆئەوەی جڵەوی بزووتنەوەی کورد بگرێتە دەست، لەکاتێکدا وەک هەندێک سەرچاوە ئاماژە پێدەکەن لەپاڵ پێگە ئاینیەکەی گەورەترین بازرگانی تووتن بوو و رکابەری کۆمپانیای ریجسی فەرەنسی دەکردا.  ئەمە نەک سەرەتای ناسیونالیستی کوردی نەبوو،

وەک زۆرینەی سەرچاوە مێژووییەکان بە نەشارەزاییەوە ئاماژەی پێدەکەن، بەڵکو سەرەتا لەرێلادانی مێژووی کورد بوو، کە تا ئێستاش کۆمەڵگای کوردی بە دەستیەوە دەناڵێنێت.

دوای جەنگ شێخ مەحمودیان بەرزکردەوە، لەراستیدا هێنانی شێخ مەحمود پەیوەندی بەهەمان ئەو هاوسەنگیە خێڵەکیەوە هەبوو، کە ئاماژەمان پێکرد، ئەوەی لەمێژووی کوردا پێی دەگوترێت حکومەتی یەکەمی شێخ مەحمود لەو سیناریۆییە زیاتر نەبوو، هەر کاتێک کاریان بەشیخ نەما گرتیان و رەوانەی هیندستانیان کرد، پاشان هینایانەوە، لەکۆتایدا لەژێر دەسەلاتی پاشای ئیراق، واتە هەمان هاوسەنگی خێڵەکی بەڵام لەسەر ئاستیکی فراوانتر، شوێنیان کردەوەو تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کرد لە بەغدا هێشتیانەوە. دوای ئەوە بایەخیان بە بنەماڵەی بارزانیەکاندا، هەر کاتێک کاریان پێیان هەبوو، زەقیان دەکردنەوەو دواتریش، کەکاریان پێیان نەدەما، لە پەنای سوپای ئێراقەوە راوەدوویان دەنان و لەگۆرەپانەکەیان دووردەخستنەوە، تێکچوونی ئەوەی ناویان ناوە شۆڕشی ئەیلوول دەکەوێتە هەمان چوارچێوەوە، هەر کاتێک کاریان بەبارزانی نەما، دەستیان لێبەرداو ئەویش لەبەردەم شای ئێراندا رایگەیاند، کە ئەرکی ئەو تەواو بوو دوای ئەوەش لە ئەمریکا داوای پەناهەندەیی بۆ خۆی و کوڕەکانی کرد!.

لەدوای شەستەکانەوە کاریان لەسەر دروستکردنی بنەماڵەیەکی تر کرد بۆئەوەی لەگەڵ بنەماڵەی بارزانیەکان هاوسەنگی پێبکەن، هەر بۆیە دەبینین تاڵەبانی نزیکەی نیو سەدە خۆی وەکو دوژمنێکی سەرسەختی بنەماڵە گەرایی نیشان داو هێزەکەی بەناوی نەهێشتنی

بنەماڵەو حوكمی بنەماڵەییەوە پەروەردە دەكرد، بەمەش دەیان هەزار بگرە سەدان هەزار رۆڵەی كوردی كردە قوربانی، كەچی لەكۆتایدا خۆی بووە دەسەڵاتێكی بنەماڵەیی و لەدوایی خۆی حیزبە سوسیال دیموكراتەكەی بەمیرات بۆ كوڕو برازاكانی هێشتەوە، لەبەرئەوەی هاوكێشەكە لە خودی تاڵەبانی گەورەتر بوو!. لە ئێستاشدا ئەو هاوسەنگیەی لەنیوان هەردوو بنەماڵەی تالەبانی بارزانی دروستكراوە، هاوسەنگیەكە دۆخی كوردستانی راگرتووەو ریگا نادات یەك هەنگاو بەرو پێشەوە بچێت و لەو چوارچێوەیە دەربچێت، كە بۆی كێشراوە، هەر كاتێكیش هەر لایەكیان هەوڵیدا ئەو چوارچیوە تێكبشكێنیت، ئەوا لەگۆرەپانەكەی دووردەخەنەوە و دەسەڵاتەكە دەگوازنەوە بۆ نەوەو برازاكانی، وەك ئەوەی لەدوای ریفراندۆم بینیمان.

كەواتە بۆئەوەی كورد لە مۆدێلی بنەمالەی سیاسی رزگاری بێت، دەبیت ببێتە خاوەنی مۆدێلی سیاسی تایبەت بەخۆی، ئەمەش لەرێگای گۆڕینی ئەو میكانیزمەوە دەبێت، كەزیاتر لەسەد سالە بەریتانیەكان بۆیان كێشاوە و ئەمریكییەكانیش لەسەری رۆیشتوون. دەبێت لەسەر بنەمای ئەو هاوسەنگیە مێژووی كورد بخوێنرێتەوە نەك ئەو لاپەڕە رازاوەو ناڕاستانەی مێژوونووسان لەرابردوودا كاریان لەسەر كردووە.

## مەسەلەی ئاوارەکان، یا گۆڕینی دیمۆگرافیای کوردستان!

2021\4\11

ئەمڕۆ یەکەم کۆنگرەی گەڕانەوەی ئاوارەکان بەسەرپەرشتی سەرۆک وەزیرانی ئێراق لە بەغدا بەسترا، دیارە مەسەلەی گەڕانەوەی ئاوارەکان پێویستی بەبڕیاری جدی هەیە نەک بەکۆنگرەو کۆنگرەکاری، ئەگەر گریمانی ئەوە بکەین بڕیاری گەڕانەوەشیان بدرێت، کە زۆر ئاستەنگە ئەو بڕیارە بدرێت و تەنانەت ئەگەر دراش توانای جێبەجێکردنی نیە، لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

1-ئاستەنگە ئەو بڕیارە بدرێت، لەبەرئەوەی خودی مەسەلەی ئاوارەکان مەسەلەیەکی هەرێمی جیهانیەو پەیوەستە بە داڕشتنەوەیەکی نوێی نەخشەی سیاسی ناوچەکە، بەتایبەتیش دابەشکردنەوەی کوردستان لەسەر بنەمای جیۆدیمۆگرافی، واتا لەجیاتی ئەوەی کوردستان لەسەر بەتەنیا لەسەر بنەمای جوگرافی دابەش بکەن، وەک ئەوەی لەدوای جەنگی دووەمی جیهانیەوە دابەشیان کرد، کە بووە هۆی هینانەدی هاوسەنگیەکی ئاڵۆزو، ئەمجارەیان لەسەر بنەمای هەر دوو رەهەندی جوگرافی (زۆنی زەردو سەوز) ورەهەندی دیمۆگرافیا(مەسەلەی ئاواەرکان) دابەشی بکەن، تاوەکو بەیەکجاری ئەو ناوچەیە لەکورد دابماڵن و شتێک نەمێنێت بەناوی مەسەلەی کوردو جوگرافیایەک نەمێنێت بەناوی کوردستان. وەک زۆر جاری تر ئاماژەم پێکردووە یەکێک لە ئامانجە مەترسیدارەکانی

دروستکردن و یارمەتیدانی دانی ڕێکخراوی داعش ئەو ئامانجە ترسناکە، واتە گۆڕینی دیمۆگرافیای کوردستانە!.

2- هۆی ئاستەنگی جێبەجێکردنی هەر بڕیارێک ئەگەر لەمبارەیەوە دەربچێت، دەگەڕێتەوە بۆ :

أ- ئەو ناوچانەی کە لێیەوە هاتوون بە بەراوردکردنیان بە هەرێمی کوردستان ئەو ئارامی و سەقامگیریەی نیەو شێوازی ژیان لەهەریم بەراورد ناکرێت لەگەل ناوچەکانی خۆیان.

ب-ئەو یارمەتیانەی لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکانی ترەوە بۆیان دابین دەکرێت، وا یکردووە مەسەلەی مانەوە لەکەمپەکان ببێتە جۆرێک لە بەدەستهینانی ژیانێکی ئازاسان و تەوەزلانەو تەنانەت شێوازێکیش لە بارزگانی، کە بیگومان ساویلکەییە ئەگەر واتیبگەین ئەمە هەر وا روویداوەو هیچ پلانیکی تری لەدواوە نیە

ت-بەشێکی زۆر لە ئاوارەکان، بەتایبەتی ئەوانەی لەرووی داراییەوە وەزعیان باشە هاتوونەتە ناو شارەکانی هەرێم و تێکەڵ بەخەلکەکە بووین، ئەوانە خانوو و موڵک و ماڵیان کرێوەو بەرژەوەندیەکانیان لێرە جێگیر بووە، کارو کاسبی خۆیان دەکەن و لە ماوەی حەوت سالی رابردوودا، هەزاران منداڵیشیان لەهەریمی کوردستان لەدایک بووە، کە ئەوانە ئینتمایان بۆ هەرێم دەبێت و مافی هاولاتی ئەو شارەو مانەوەی یەکجاری بەدەستدێنن!.

کەواتە مەسەلەی ئاوارەکان مەترسیەکی ئێجگار جدیەو ئەگەر ئێستا بەراوردێک لەنێوان دۆخی هەریم بەر بەر لە 2014 بکەین، دەبینین دیمۆگرافیای شارەکانی هەرێمی کوردستان بە تەواوی گۆڕاوە، بەراستی دەسەڵاتی کوردیش بەرپرسی یەکەمە لەو دۆخە، لەپەنای مەسەلەی ئاوارەکانەوە وڵاتیان هەرزانفرۆش کردووە!. بەگوێرەی هەندێک زانیاری تورکیاش زەوی و زارێکی زۆری بەناوی کۆمپانیاو کارکردن و ... هتد لە شارەکانی هەرێم، بەپلەی یەکەمیش لەهەولێر کڕیوە، ئەمانە هەمووی گەمەی سیاسی مەترسیدارن و چارەنووسی ئەو هەرێمە تاریکتر دەکەن، بەبێئەوەی ئاگاداربین لەلایەن دەسەڵاتدانی کوردەوە وڵاتەکە بەتەواوی هەراجکراوە، بەناوی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و میواندۆستی خێڵەکیانە، خاک و ئاوی ئەو وڵاتەیان بۆ هەموو کەسێک، جگە لە رۆڵە رەسەکانی خۆی حەڵاڵ کردووە.

## چەند وشەیەکی بریندار لە یادی ئەنفالدا

2021-4-14

ئەگەر بەر لە رووخانی رژێمی بەعس، ئەنفال تاوانێکی مرۆڤایەتی بوو بێت بە تەوێڵی رژێمی بەعس و ئەوانەی یارمەتیاندا لکابێت، ئەوا دوای رووخانی ئەو رژێمە ئەنفال شەرمەزاریەکی گەورەیە بۆ دەسەلاتداری کوردی، کە نەک هەر هیچ هەڵوێستیکی بەرامبەر بەشێکی زۆر لەو تاوانبارانە نەبوو، بگرە لە پەنای خۆشی داڵدەی دان و لەتووورەیی خەلکی کوردستان و تەنانەت دادگاکانی حکومەتی نوێی ئێراقیش پاراستوونی!. داڵدەدانی ئەو جۆرە تاوانبارانە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا کەمەو خۆی لەخۆیدا بەشداریکردن و پاڵپشتیکردنە لەو تاوانە، دەتوانین بڵێین لەڕووە یاساییەکەشەوە ئەوەی تاوانبارێکی لەو جۆرە دالدە دەدات و بەرگری لێدەکات، وەک هاوبەشێکی ئەو تاوانە هەژمار دەکرێت، بەتایبەتیش ئەگەر ئەوەمانزانی بەشێکی زۆر لەو تاوانبارانە بوونە هێزی چەکداری حیزبە باڵا دەستەکانی کوردستان و دوای رووخانی رژێمی بەعسیش شارەکانی کوردستان، لەوانە پایتەختی هەریم کرایە مۆڵگەی تاوانبارانی ئەنفال و ماڵ و منداڵەکانی ئەو تاوانبارانە!. ئەو هەڵوێستەی سەرکردایەتی کورد هەرگیز ناکەوێتە خانەیی لێبووردەیی و برەودان بەئاشتی کۆمەڵایەتی وەک بانگەشەی بۆ دەکەن و دەیانەویت نیشانی خەڵکی بدەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە جگە لەخیانەتێکی نیشتمانی هیچ خوێندنەوەیەکی تر لەخۆوەناگرێت.

ئەرمەنەکان لەهەموو دونیا بەدوای تاوانبارانی جینۆسایدی ئەرمەنەکانەوە بوون و تا بە سزای گەلیان نەگەیاندن ئۆقرەیان نەگرت، جوولەکەکان تا ئێستاش بەردەوامن لەگەڕان بەدوای ئەو تاوانبارانەی لە هۆلۆکۆستی جولەکەکان بەشداریان کرد، بەڵام سەرکردەکانی کورد لەپاڵ خۆیان حەشاردان و دەستیان بەسەریانداهێنا!. ئەم دۆخە پرسیاری گوماناوی و سەرسوڕهێنەر لای تاکی کورد دروست دەکات!، دەبێت هۆی ئەو هەڵوێستە پڕ شەرمەزاریانەی سەرکردایەتی کورد چی بێت؟ جێگای داخە بڵێم بەگوێرەی ئەو بەڵگەنامانەی رۆژانەو ساڵانە لەمیدیاکاندا بڵاو دەکرێنەوە، زیاتر و زیاتر لەوە نزیکمان دەکاتەوە، کە ئەوانەی خۆیان وەک حزبی سەرەکی و سەرکردایەتی کورد لەباشوور نیشانی خەلک دەدەن، بەشێوەیەک لەشێوەکان لینکێکیان لەو تاوانە گەورەیە هەیەو تێیەوە گلاون، ئەگینا ئەو هەڵوێستە پڕ شەرمەزاریە هەرگیز ناکەوێتە خانەی لێبووردەیی، لەکاتیکدا هەموو ئەوە دەزانین ئەوانە لەسەر تەپۆلکەیەکی وشک و برینگ هەزاران گەنجی کوردیان کوشت و بەکوشتن دا.

## هەولێر وەک گۆڕەپانی شەڕێکی نوێ

2021\4\15

ماوەیەکە لەرێگای رۆکێت و دوێنی شەویش لەرێگای فڕۆکەی درۆنەوە هێرش کرایە سەر هەولێر، ئەو هێرشە بەردەوامانە لەماوەیەکی کەمدا واتای ئەوەیە هەولێر خەریکە دەبێتە گۆڕەپانێکی شەڕی نوێ و لەچوارچێوەی ململانێیەکی جیهانی و قۆناغێکی هەستیاروو یەکلاییکەرەوە سەنتەر دەگرێت!

بۆچی هەولێر دەکرێتە گۆڕەپانی شەڕ. یاخود بە واتایەکی تر ئایا قۆناغێکی تر لە ململانێیە جیهانیەکان دەستیپێکردووە، کە هەولێر لەو ململانێیەدا دەکرێتە گۆڕەپانی شەڕێکی نوێ؟

ئەوەی لەهەولێر دەگوزەرێت رەهەندێکی جیهانی و هەرێمی هەیەو دەرهاویشتەی ئەو گۆانکاریانەیە، کە لە هاوسەنگی هێزی جیهانی هاتۆتە ئاراو دێتە ئارا. ئەگەر لە روانگەیەکی جیۆستراتیژی و فراوانە سەیری ئەو ناوچە هەستیارانەی ئۆراسیا بکەین، کەهۆکاری گرنگ و یەکلاییکەرەوەن لە ململانێیە جیهانیەکان!. بۆ سەرلەنوێ دارِشتنەوەی سیستەمی جیهانی، بۆمان دەردەکەوێت هەموو ئەو ناوچانە لەگرژیەکی ترسناکدان و ئەگەر هەر هەڵەیەکی بچووک لە ئیدارەدانی ئەو ململانێیە بکرێت، رەنگ بێت شەڕێکی جیهانی لێبکەوێتەوە، کە تەڕو وشک بەیەکەوە بسوتێنێت.

بۆئەوەی بەوردی لەو شرۆڤەکردنە تێبگەین، بەکورتی ئاماژە بۆ ئەو گۆڕانکارایینە دەکەم، کە لەماوەی 30 ساڵی رابردوودا بەسەر سیستەمی جیهانی داهاتووە. دوای رووخانی بلۆکی رۆژهەڵات، کە سیستەمی تاکجەمسەری تیادا راگەیەنراو ئەمریکا خۆی وەک براوەی شەڕی سارد پیناسە کرد، دوای ئەوە لە ساڵی 2002 ئەفغانستان و لە ساڵی 2003 راستەوخۆ ئێراقی داگیرکرد، دوای ئەوە لەرێگای سوود وەرگرتن و بەکارهێنانی ئەوەی پێی دەگوترێت بەهاری عەرەبی، لە باکووری ئەفریقاوە ئەو رژێمانەی روخاند، کە دەکەوتنە مەداری سۆڤیەتی پێشوو و وەک میسرو لیبیاو پاشان بەرەو سوریا هات، کە بنکەیەکی گرنگی سۆڤیەت بوو لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست، تاکە پێگەی روسیا بوو، کە لەسەر ئەو دەریایە بۆی مابووەوە.

بەم چەشنە ئەمریکا هەوڵیدەدا لە سنوورەکانی باشوورەوە روسیا ئاووڵوقە بدات، شان بەشانی ئەمەش لەرێگای هاوپەیمانی باکووری ئەتڵەسی (ناتۆ) وە دەیویست لە رێگای چەند پڕۆژەیەکی ستراتیژیەوە، لەوانە هاوبەشی رۆژهەڵات، خۆی بگەیەنێتە بن دیوارەکانی روسیا، ئەم هەڵوێستەش بەردەوام بوو، تاوەکو لە ساڵی 2008 روسیا پەلاماری گورجستانی داو هێڵی سووری بۆ ئەمریکاو هاوپەیمانی ناتۆ دانا، بەڵام ئەو ململانێیە بەردەوام بوو، تاوەکو لە ساڵی 2013 هەوڵەکانی ناتۆ گەیشتە ئۆکرانیاو لە لوتکەی ڤیلیزۆسی ناتۆ (2013) قسە لەسەر ئەوە کرا، ئۆکرانیا رێکەوتننامەی هاوبەشی رۆژهەلات ئیمزا بکات و دواتر ببێتە ئەندام لە هاوپەیمانی ناتۆ، ئەمە وایکرد روسیا راستەوخۆ لەساڵی 2014 نیمچە دورگەی کریم بە وڵاتەکەی بلکێنێتەوە، پاشان پەڕیەوە بۆ

سوریاو له ساڵی 2015 خۆی له سوریا هەڵقورتاند، بەمەش هاوسەنگیەکە لە بەرژەوەندی روسیا شکایەوەو گەڕانە دواوەی ئەمریکا بەشێوەیەکی بەرچاو دەستیپێکردو گەڕێکی تر لەشەڕی ساردی نوێ دەستیپێکردەوە.

ئەو ململانییانە لە هەموو شوێنیک بەردەوام بوو، وادیارە ئێستا قۆناغی دووەمی هەڵمەتی بەرەی هاوپەیمانی روسی دەستیپێکردۆتەوەو دەیانەویت بە یەکجاری ئەمریکا لەو ناوچەیە دوور بخەنەوە، بۆیە دەبینین لە ئۆکرانیا، کە دەکاتە دەروازە روسیا بۆ ئەوروپاو لە تایوان و لەناوچەی کەنداو لە رۆژئاواو باشووری کوردستانیش خەریکە گرژیەکان گەرمتر دەبن و ململانێیەکان چڕتر دەبێتەوە. هێندەی پەیوەندی بە کوردستانەوە هەیە، دیارە ناوچەی سەوز کەوتۆتە ژێر کۆنترۆڵی ئێران، ئێرانیش هاوپەیمانیکی نزیکی روسیایە لە شە،ی ئەمریکاە هەولێریش کەوتۆتە ژێر هەژموونی تورکیا، ئەویش وەک ئەندامێک لەناتۆ دەبێت پاڵپشتی هەولێر بکات، بەڵام دۆخەکەیە لێرەدا رێک پێچەوانەیەو تورکیا لەریگای روسیاو ئێرانەوە دەیەوێت، هەولێر بکاتە گۆڕەپانی شەڕو بۆ ئەوەی هەردوو هەرێمی کوردی لەباشوورو رۆژئاوای کوردستان لەناو بەرێت!

کەواتە ئێستا هەولێر و قامشلۆ، بوونەتە، یاخود خەریکە دەکرینە چوارگۆشەی قەیرانەکان و ئەگەری ئەوەی هەیە شەڕی گەورەی تیا دابگیرسێت، تورکیا دەیەوێت، ئەو دەرفەتە بقۆزێتەوەو پەلاماری رۆژئاوای کوردستان بدات، لەدواجاردا ئەگەر ئەمریکا وەک چەند ساڵی پێشوو گڵۆپی سەوزی بۆ دابگیرسێنێت و بەرامبەر مانەوەی تورکیا لە هاوپەیمانی ناتۆ سازش لەسەر مەسەلەی کورد بکات، ئەو کاتە شەڕەکە

به تەنیا دژی کورد دەبێت و زەرەرمەندی یەکەمیش لێی کورد دەبێت. لەبەرئەوەی ئەمریکا ئەمریکا چیتر توانای ئیدارەدانی جیهانی نەماوەو دەیەوێت وەکو قۆناغی یەکەمی شەڕی سارد، لەریگای هاوپەیمانەکانیەوە (تورکیا) ئەو ناوچەیە لەژێر هەژموونی خۆی بهێڵیتەوە و ئاوی رووی خۆی بپارێزێت و ناوچەکە جێبهێڵێت، کە ئەمەش یەکیکە لە ئەگەرە بەهێزو ترسناکەکان، چونکە بە هەموو پێوەرەکانی هێز ئەمریکا لە پاشە کشەدایە، بۆیە روودانی شەڕێک لە رۆژئاوای کوردستان ئەگەریکی بەهێزە!

هێندەی پەیوەندی بەهەولێرەوە هەیە، راستە وەک هاوپەیمانی تورکیا خۆی نیشان دەدات و واتیدەگات، کە تورکیا دەیپارێزێت، بەڵام تورکیا وەکو دەستکەوتیکی کورد سەیری ئەو هەرێمە دەکات نەک دەستکەوتی پارتی دیموکراتی کوردستان، بۆیە لەهەولی ئەوەدایە، کە بە هەر سازشکردنێک بێت و هەرچەندەی تێبچێت، ئەو هەرێمەش هەڵبوەشێنیتەوە، ئەگەر بۆی بلوێت ویلایەتی لەژێر دەسەلاتی خۆی بهێڵێتەوە وەک ئەوەی روسیا بەرامبەر نیمچە دورگەی کریم کردی و ئێستاش دەیەویت بەرامبەر کۆی ئۆکرانیای بکات، ئەگەر بۆشی نەلوا ئەوا بەناوی یەکپارچەیی خاکی ئیراق، ئەگەر بەشێوەیەکی رەمزیش بێت بە ئیراقی بلکێنێتەوە. چونکە وەک دەیان و سەدان جار بەرپرسە تورکەکان راشکاوانە دەیلێێنەوە، ئەوان دژی  هەر قەوارەیەکی کوردین ئەگەر لە ئەفریقاش بێت!.

لاوازبوونی پێگەی دەسەلاتدارانی کوردی لەسەر ئاستی نیودەولەتی و هاتنە پێشەوەی مامەلەکردن لەگەڵ ئێراق بە پلەی یەکەم لە ئێستادا، دەرواە یەکە دەتوانین ئەو خویندنەوەی تیادا بسەلمێنین!.

## بێبەهاکردنی ژیان و پیرۆزکردنی مردن لەململانێیەکاندا

د. کامەران مەنتک
2021\4\23

مردن پڕۆسەیەکی سروشتیە، لەگەڵ پڕۆسەی لەدایک بووندا لەدایک دەبێت، لەنێوان لەدایک بوون و مردندا هێڵێکی باریک هەیە، کە پێی دەگوترێت ژیان، کاروانی گەشەسەندنی مرۆڤ لەسەر ئەو هێڵەدا بەڕێوە دەچێت، گەمە سیاسیەکانیش بە هەمان شێوە لەسەر هەمان هێڵدا دەگوزەرێن و هەندێک دەیانەوێت لەپێناو درێژە پێدان بەو قۆناغەو هێنانەدی بەختەوەری ، مردن وەک ئامرازێک لەپێناو مانەوەی خۆیان بەکاربهێنن، بەڵام مردنی خۆیان نا بەڵکو مردنی خەڵکانی تر!.

مردن، کە خاڵی کۆتایی ژیانێکی سروشتیە و گەڕانەوەیە بۆ دۆخێکی ترو گەڕێکی تر، زۆرینەی هەرە زۆری مرۆڤەکان لێی دەترسن، لەبەرئەوەی سروشتی مرۆڤ وایە لە هەموو ئەو شتانە دەترسێت، کە ئەو دیو پەردەکەی لا روون نیە!. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ترسە زۆر جار جوان دەکرێت و هانی خەڵک دەدرێت بۆئەوەی لەجیاتی درێژەپێدان بەژیان بەخۆشحاڵیەوە نەک تەنیا بەرەو مردن هەنگاو بنێن بەڵکو بەکارێکی پڕ شکۆو قارەمانانەشی ببینن. ئەو جۆرە مردنە لەئاینەکان و کەلتوورە شۆڕشگێڕیەکاندا زاراوەی شەهیدبوونیان بۆ داناوە، ئەو زاراوایە بەشێوەیەک پیرۆزکراوە، کە پاڵ بە مرۆڤەکانەوە بنێت بەجۆشەوە بەرەو مەرگ بچێت و بەراکردنەوە بە ئاڕاستەی ئەو هەنگاو بنێت، کە ئەمە پێچەوانەی سروشتە، لەبەرئەوەی وەک ئاماژەمان پێکرد پڕۆسەی ژیان دەکەوێتە سەر ئەو هێڵەی لەنێوان لەدایک بوون و مردندا هەیە، بۆئەوەی پڕۆسەکە بەشێوەیەکی سروشتی بەڕێوەبچێت، بنەمای

سەرەکی ئەوەیە مرۆڤ بەشێوەیەکی سروشتی هەنگاوەکانی دوای لەدایک بوون ببڕێت و بەسەر هێڵەکەدا رەتبێت تا دەگاتە خاڵی کۆتایی، واتە مردنەکە، کورتی و درێژی هێڵەکە، واتە ئەو رێگایەی لەنێوان خاڵی یەکەم(لەدایک بوون) و خاڵی دووەم (مردنەکەدا) هەیە هیچ لەبابەتەکە ناگۆڕێت، لەبەرئەوەی ئەویش پڕۆسەیەکی پوختی سروشتەو هەندێک مرۆڤ بەهێزو هەندێکی تر بێهێزو هەندێک لەشساغ و هەندێکی تر بەکۆمەڵێک نەخۆشیەوە ژیان دەگوزەرێنن. ئەم دۆخە لەنێو هەموو بوونەوەرەکانی تر بە وەستاوو (داروبارەکان) بزۆکیانەوە، ئەوو بوونەوەرانەی تر، کە لەشوێنێکدا سەقامگیر نین، یا بەقاچەکانیان دەجولێنەوە یاخود بە باڵەکانیان دەفڕن، لەنێویشیاندا مرۆڤ.

ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە لەو باسەدا ئەو یاریە سیاسی و دیماگۆگیانەیە، کە لەسەر هێڵەکانی ژیان ئەنجام دەدرێت، لەپێناو نزیک کردنەوەی مردن بۆ هەندێک کەس بە مەبەستی درێژکردنەوەی بەمەبەستی درێژکدنەوەی هێڵی ژیان بۆ هەندێک لەسەر حیسابی هەندێکی تر!. بە واتایەکی تر بەشێک لەمرۆڤەکان هانی خەڵکانی تر دەدەن لەپێناو مانەوەو درێژکردنەوەی ژیانی ئەواندا بمرن، بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجەش چەندین رێگاو شێوازی جیاجیا بەکاردەهێنن و مردن لە پڕۆسەیەکی سروشتی دەکەنە ئەفسانەیەکی پڕ لە قارەمانیەتی، لە هەمان کاتدا ئەگەر مردنی کەسانی تر نەکەوێتە خزمەت مانەوە درێژکردنەوەی تەمەنی ئەوان، ئەوا مردنەکە هێندە ناشیرین و قێزەون دەکەن، بەشێوەیەک رێگا نەدرێت کەسی مردوو وەکو مرۆڤێک مەراسیمی لەگۆڕنان و حەشاردانی بۆ بەڕێوەبچێت، وەک ئەوەی سۆفرکلیس لە شانۆنامەی ئەنتگیونا باسی دەکات.

سیاسەتمەداران و سەرمایەداران و پیاوانی ئاینی، هانی مرۆڤەکانی تر دەدەن بۆ ئەوەی هێلەکەی ژیانی خۆیان بپچڕێنن و لەپیناو گەیشتن بەو بەهەشتەی بۆیان دروست دەکەن و ئەو نیشتمانەی بۆیان

دادەتاشن و ئەو ئازادیەی خۆیان لێیان زەوت دەکەن، بمرن و ژیانی سروشتی خۆیان نەژین. واتە لەژێر دەیان بچم و ناوی جیا جیاداو بە بێئەوەی بەخۆیان بزانن ژیانی خۆیان بکەنە قوربانی بەرژەوەندیەکانی ئەوان و لەپەنای بەهەشت و نیشتمان و ئازادیدا، ژیانی خۆیان لە پیناو مانەوەو خۆشگوزەرانی بەرژەوەندیەکانی ئەواندا بەخت بکەن!.

بەداخەوە کەلتووری خۆشەویستکردنی مردن و خۆزگە خواستن بەمردن، لەناو کورددا ئێجگار بەهێزەو تەنانەت لەناو ئەدەب و رۆشنبیری و گۆرانی کوردیشدا رەنگی داوەتەوەو برەوی پێدراوە. کەم گۆرانی هەیە ئەوەی تیادا نەبێت، کە کاکی گۆرانیبێژ حەز نەکات کاتێک تێر لە بالآی یاری رادەمێنێت، گیانی شیرینی دەرنەچێت، (راستە مردن ناخۆشە بەلآم ئاواتی منە!). ئەم بیرکردنەوەیە ئەفسانەییە بێڕێزیکردنە بەرامبەر سروشت و خودی پڕۆسەی ژیانەکە، چونکە ژیانە سروشتیەکە واناخوازێت لە یاری رامبێنێت و گیانی دەربچێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە وادەخوازێت، کە تا کۆتایی هێڵەکەی ژیان لەگەڵیدا بمینێتەوەو بەو هۆیەوە بەختەوەری و ژیانێکی ئاسوودە بەدەست بێنێت!. کام گەنجی کورد هەبووە خەونی بەوە نەبینیوە لەسەر چیایەکەوە نەوەستابێت و تفەنگی لەدەست نەبێت و بەرگری لەوڵاتەکەی بکات و لەولاشەوە یارەکەی چرکە ساتی ئاویکەدان و مردنەکەی ببینێت!. برۆ ناوچیرۆک و ئەفسانەو لاوک و حەیران و گۆرانی کوردی بەدەیان نمونەی لەو بابەتەت بەرچاو دەکەوێت.

لەراستیدا ئەوە نەخۆشیەکە لەشێوازی بیرکردنەوەو پێویستی بەچارەسەری هەیە، بەرامبەر ئەوەی، کە چین و توێژو خەڵکانی سیاسەتمەدارو بەناوئایندار مردن خۆشەویست دەکەن، پێویستە رۆشنبیران و هزرمەندان مردن بخەنەوە چوارچێوەی پڕۆسە سروشتیەکەی خۆیەوەو رێگا نەدەن، هیچ کەسێک ژیانی کەسانی تر لەپێناو مانەوەو درێژەپێدان بەژیانی خۆی بەکاربێنێت، هێندەی پەیوەندی

بە تاکی کوردیشەوە هەیە، دەبێت هان بدرێت و فێری هونەری ژیان بکرێت نەک هونەری مردن، لەبەرئەوەی تاوەکو لە بەهای ژیان تێنەگات هەرگیز ناتوانێت بەهای مردنەکەی بزانێت، چونکە ئەمانە هەمووی بەیەکەوە کۆی پرۆسەیەکی تەواو (لەدایک بوون، ژیان و ئینجا مردن) پێکدەهێنن. بەم چەشنە ژیان دەکەوێتە پێش مردنەکەو ئاسایی دەبێت ئەگەر لەپیناو مانەوەو ژیانەکەدا مردنیش هەڵبژێردرێت، ئەوکاتە بابەتەکە دەکەوێتە دووتوێی خەباتکردن لەپیناو مانەوەدا نەک مردن لەپیناو ژیانی فریوبازی سیاسی پیاوە ئاینی و ئایدیۆلۆژیستە ساختەچیەکانەوە!.

## ئافەرین گەلی ئەرمەنی

2021\4\24

یادی کوشتاری ئەرمەنیەکان و ئەنفالی کورد، زۆر لەیەکتر دوور نیە، بەڵام دوو بابەتن هەرچەندە یەک ناوەرۆکیان هەیە، لەخستنە روو و شێوازی کارکردن لەسەریاندا جیاوازیەکی زۆر بەدیدەکرێت. ماوەی زەمەنی نێوان ئەنفال و جینۆسایدی ئەرمەنەکان 73حەفتاو سێ ساڵە، واتە ئەنفال دوای 73 ساڵ لەکوشتاری ئەرمەنیەکان روویدا، سەرباری ئەو ماوەیە ئەرمەنەکان وەک گەلێکی زیندوو، ئەو تاوانەیان فەرامۆش نەکردووە وەک ئەوەی ئەمڕۆ روویدابێت هەرگیز رێگا نادەن کۆن ببێت و لە یاددانی گەلی ئەرمەنیدا بەردەوام زیندووە، کەچی ئەنفال، کە تەنیا 33 ساڵی بەسەرچووە، لەو سی و سێ ساڵەش نزیکەی 30 ساڵ حوکمی بەناو فەرمانرەوایی کوردی بووە، واتە دەرفەتی کارکردن لەسەری باشتر بووە، کەچی خەریکە وا لەیاد دەکرێت. ئەرمەنەکان تاوانی جینۆسایدی گەلەکەیان بەدیکۆمێنت کردووە، کەچی کورد نەیتوانیوە وەک زۆربەی لایەنەکانی تری ژیانی ئەو تاوانەش بە دیکۆمێنت بکات و بەشێوەیەکی ورد توێژینەوەی لەسەر بکات و دەزگایەکی تایبەت بە بەلگەنامەکانی ئەنفال دابمەزرێنێت. ئەرمەنەکان راوەدووی تاوانبارانی جینۆسایدی گەلەکەیان ناو بەشێکی زۆری بەرپرسە پلە یەکەکانیان بە سزای گەلەکەیان گەیاند، کەچی تاوانبارانی ئەنفال رێزیان لێنراو لەحکومەتی بەناو کوردی دیوەخانانەیان بۆ دانراو پارەو بۆجەی تایبەتیان بۆ

تەرخانكراو نەک داگایی نەكران، بگرە لە داگای تاوانەكانی ئێراقیش پارێزران و نەدرانە دەست!. ئەوانەی حینۆسایدی گەلی ئەرمەنیان کرد دیار بوون، كەچی زۆر لەتاوانبارانی ئەنفال لەنێوان جاش و شۆڕشگێرەكاندا بەشێوەیەک تێكەڵن، كە خەڵک ناتوانێت لە یەكتریان جیا بكاتەوە!.

خاڵێكی گرنگتر هەیە، كە پێشتر لە توێژینەوەیەكمدا باسمكردووە(تورک و جینۆسایدی كورد) هەر لەو ساڵەی ئەرمەنیەكانی تیا جینۆساید كرا، واتە ساڵی (1915)، لەپەنای هەمان یاسا (یاسای راگواستنەوەی بەزۆر) وەک سەرچاوە مێژووییەكان ئاماژەی پێدەكەن، نزیكەی 700 هەزار كوردیش لەشوێنەكانی خۆیان لەناوچە سنووریەكانی باكووری كوردستان راگوێزرانەوەو شوێن بزركران، واتە ئەو كوردانەی بە یاسای راگواستنەوەی بەزۆری عوسمانیەكان كوژران ئەگەر لە كوژراوەكانی ئەرمەنیەكان زیاتر نەبێت كەمتر نیە، بەڵام كورد نەک هەر باسی ناكات بگرە مێژوو نووسەكانیش چاوپۆشیان لەو بابەتە كردووە. كاتێک (تورک و جینۆسایدی كورد) م بڵاوكردەوە، داوام لە پەرلەمانی كوردستان كرد، ئەو بابەت زیندوو بكاتەوە وەكو ئەرمەنەكان توركەكانی پێتاوانبار بكات و لەسەر گۆرەپانی نێودەوڵەتی بەكاریبێنێت، بەڵام وادیاربوو گوێی لینەگیراو دەستی توركیا لەناو پەرلەمان لە دەستی كورد بەهێزتر بوو!.

لەدوای جینۆسایدی ئەرمەنەكان توركیا چەندین جینۆسایدی تری بەرامبەر كورد ئەنجامداوە، جینۆسایدی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و شۆڕشی ئاگری داخ و جینۆسایدی راپەڕینی دەرسیم و ئەو جینۆسادەی

لەماوەی جەنگی جیهانی دووە دژی رۆشنبیرو ئازادیخوازانی باکووری کوردستان ئەنجامیدا و جینۆسایدی کورد لەماوەی حەفتاو هەشتاکانی سەدەی بیستەم و ئەو رەشەکوژیەی دوای نەوەدەکان بەناوی لێدانی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە ئەنجامیداو هەزاران خێزانی کورد ئاوارە بوون و بەشێکیان تاوەکو ئێستا وەکو دیلێکی جەنگ لەکەمپی مەخمور مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت. ئەمانەو چەندین جینۆسایدی تر، کە رۆژانەو ساڵانەوە چرکە بەچرکە دژی کورد ئەنجام دەدرێت، کەچی سەرکردەکان و تەنانەت زۆرینەی بەناو رۆشنبیرانی کوردیش مووێکیان نابزوێت!. هەر لەکاتی نووسینی ئەو وتارەدا سوپای تورکیا پەلاماری چیاکانی مەتین و ناوچەی کانی ماسێ و ناوچەکانی تری سنووری دەستپێکردووەو هەلمەتی جینۆسایدکردنێکی تری دەستپێکردووە، کەچی کۆمەڵگای کوردی بە سەمای دوو گەنج لەسلێمانی بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی دڕاندنی قورئان لەهەولێرەوە خەریک کراوە!.

بزانن جیاوازی لەنێوان گەلی زیندوو، کە سەرکردەکانیان نوینەرایەتی گەلەکەی خۆیان بکەن چەند گەورەیە لەگەڵ ئەو گەلەی سەرکردەکان داردەستی بێگانە بن و هێندەی رەچاوی بەرژەوەندیەکانی دوژمنانی میللەتەکەیان بکەن نیو هیندە رەچاوی بەرژەوەندی گەل و وڵاتەکەیان نەکەن، ئافەرین بۆ گەلی ئەرمەنی، کە زیاتر لە 73 ساڵە بەدوای تورکەکانەوەن و وەکو بنێشت پێیانەوە نووساون و لێیان نابنەوە، ئافەرین بۆ گەلی ئەرمەنی، کە هەرگیز خوێنی رۆڵە بێتاوانەکانی خۆی ون نەکردووە، دەبێت کوردیش بەو ئاڕاستەیە کار بکات و رۆژێک نەک بە تەنیا تۆڵەی ئەنفال و جینۆسایدەکانی تورک دەرهەق بەگەلەکەی

بکاتەوە، بەڵکو بەر لەوان تۆلە لەو بەناو حیزب و سەرکردانە بکاتەوە، کە خوێنی میللەتەکەیان بێبەهاکردووەو گەلێکیان ریسوا کردووەو نیشتمانێکیان هەڕاج کردووە.

## ململانێیەکان و بەرپرسیاریەتیەکان

2021\4\28

ململانێ بەشێکە لەسروشتی مرۆڤ، تاوەکو مرۆڤ هەبێت، بەرژەوەندیی جیاواز دەبێت، بەم پێیەش بۆچوون و روانگەی جیاواز بەرامبەر رووداوەکان و شێوازی دروستکردن و مامەلەکردن لەگەڵ رووداوەکان لەدایک دەبێت. بۆیە ململانێ لەسەر بەرژەوەندیەکان لەنێو هەموو کۆمەڵگایەکدا سیفەتێکی بەردەوامی هەیە، هەرچەندە لەسەر یەک ئاستدا گوزەر ناکەن و دەمیک چڕ دەبنەوەو تاوێکی تر بەنەرمی بەڕێوە بچن.

ئەگەرچی ململانێکان زۆرجار مەترسیدار دێنە بەرچاو، بەڵام کرۆکی کێشەکان لە کرۆکی خودی ململانێیەکانەوە نیە، بەڵکو لەشێوازی ئیدارەدانی ململانێیەکانەوەیە!. چونکە ئەوە شێوازە ئیدارەدانەیە، کە وا دەکات ململانێکان لەبەرژەوەندی کۆمەڵگا بشکێنەوەو ببنە هۆکاری گۆڕانگاری ئەرێنیانەو پێشووەچوون، یاخود ماڵوێرانی و کاولکاری لەگەڵ خۆیاندا بێننە ئارا. کەواتە لەشێوازو چۆنیەتی ئیدارەدا ململانێیەکاندا دەتوانین ئاستی هوشیاری و دنیا بینی کۆمەڵگاکان تێبگەین و بزانین لە چ قۆناغێکی مێژوویی خۆیدا دەژین. لەبەرئەوەی ململانێ پەیوەندیەکی پتەوی بە بەرپرسیاریەتی مێژووییەوە هەیە، هەرکاتێک ململانێیەکان لەرێگای گەشەسەندنی سروشتی خۆیان لایاندا، یاخود کۆمەڵگا کەوتە

قۆناغێکی مەترسیدارەوەو هەڕەشەی کەوتە سەر، ئەو کاتە رۆڵی بەرپرسیاریەتیەکە زەق دەبێتەوەو فاکتەری مانەوەو بەرژەوەندیە باڵاو زیندووەکانی کۆمەڵگا وا دەخوازێت هەندێک ململانێ بۆ ماوەیەک کەمبکرێنەوە یاخود سڕ بکرێن، تاوەکو قۆناغە مەترسیدارەکە تێدەپەڕێت.

تێگەیشتن لەبەرپرسیاریەتی بەشێوەکی تۆکمە بە پەروەردەو ئاستی رۆشنبیری تاکەکانەوە بەستراوەتەوە، بە واتایەکی تر پەیوەندی بەشێوازی گۆشکردن دروستکردنی کەسایەتی تاکەکانەوە هەیە، چەندەی تاکەکان هوشیارتر بن، زیاتر لە بەرپرسیاریەتیەکانی خۆیان تێدەگەن و سنووری ململانێیەکان دەزانن، بەپێچەوانەی ئەمەش هەر کاتێک کەسایەتیەکان لەو ئاستەدا نەبوون، ئەو کاتە رەچاوی بەرژەوەندیە نیشتمانی و نەتەوەییەکان ناکرێت هەر کەسەی ئاردی خۆی لە ئاشێک لێدەکات، ئەمەش جۆرە فەوزاریەک دێنێتە ئارا، لەکاتێکدا دەبێت رێز لەئیدارەدانی ململانێکان بگیرێت و هەموو تواناکان بۆ رووبەڕووبوونەوەی بەرژەوەندیە باڵاکان کۆبکرێنەوەو یەکبخرێنەوە، کەچی لەجیاتی ئەمە وەک کورد دەڵێت پێ لە تەختەی چرووک دەنرێت و لەپەنای دروشمی زەق و بریقەدارەوە، راستیەکان دەشێوێنرێت و سەرچیخکردن و تێنەگەیشتن لە دۆخەکەو لەئاست نەبوونی بەرپرسیاریەتەکە، وەک تێگەیشتن و بەرپرسیاریەتی دەخرێتە بەرچاوی خەڵک.

بەداخەوە ئەمە رێک ئەو دۆخەیە، کە لەباشووری کوردستان دەگوزەرێت. لەکاتێکدا هەموو باشوور کەوتۆتە ژێر هەڕەشەی پۆستاڵی سوپای تورکیا، لە پەرلەمانی کوردستان گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکرێت

مریشک لە هێلکەیە یاخود هێلکە لەمریشکە، میدیاکان لەجیاتی ئەوەی هەوڵبدەن ئاڕاستەی پارتی کرێکارانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان لە یەکتر نزیک بکەنەوە، کار لەسەر زیاتر پەرتەوازەکردنی ئەو دوو هێزە دەکەن و بەشێوەیەک لەشێوەیەکان دەهۆڵی شەڕ دەکوتن. میللەتی هوشیار دەبێت لەوە تێبگات ئەو هێرشەی تورکیا راستە رووکەشدا دژی پارتی کرێکارانی کوردستانە، بەڵام بەراستەقینەدا دژی هەموو کوردەو بە پلەی یەکەمیش پارتی دیموکراتی کوردستان لێی زەرەمەندە، چونکە شەڕەکە لەناوچەی ئەو دەگوزەرێت و هیزەکانی تورکیا نەک ئەو دەڤەرە، بەڵکو ئابڵووقەی خودی بارزانیشیان داوە، کەواتە ئەگەر تورکیا باشووری کوردستان بە تەواوی داگیر بکات ئەوە یەکەمین جار تەواوی ناوچەکانی پارتی بەشێوەیەکی کردەیی داگیر دەکات، نەک بە تەنیا چەند بنکەو بنەگەیەک دابنێت!. بۆیە هەرچەندە ململانێکانی نێوان پارتی و پەکەکە چرو قووڵ بێت، خالە هاوبەشەکانیان، کە رەنگ بیت خالی بنەڕەتی مانەوەی ئەو دوو هیزە بێت، زۆر لە خالە جیاوازەکان گرنگترو ستراتیژیترە، هەردوو هێز دەبێت درک بەوە بکەن، جۆرە هاوسەنگیەکی هەستیار لەنێوان هەردولایان دروستکراوە بەشێوەیەک کەوتنی یەکیکیان دەبێتە هۆی کەوتنی ئەوەی تر. بۆیە پێویست دەکات لەو قۆناغە هەستیارەدا رۆلی تیگەیشتن لەبەرپرساریەتیەکان زیاتر زەقتر بکرێتەوەو هەموو لایەک لە ئاستی بەرپرسیاریەتیە مێژووییەکاندا دابن، هەرچۆنێک بێت دەبێت ململانێیە ناوخۆییەکان نەرمتر بکرێتەوەو پردی پەیوەندیەکان بەهێزتر بکرێت و هەموو هێزەکان بۆ بەرپەچدانەوەی هەڕەشە دەرەکیەکان کۆبکرێتەوە.

دەبێت تاکی کورد و ئەوانەی پێیان دەگوترێت حزبی کوردی لەو قۆناغەدا هوشیارانەتر بیر بکەنەوە، دوژمنەکان بەکەم سەیر نەکەن و بەتەواوی لە ستراتیژی ئەوان تێبگەن، راستیەکی تاڵ هەیە پێویستە بینۆشن و درکی پێبکەن، ئەویش ئەوەیە تورکیاو ئیران و سوریاو ئێراق، کە هەرچەندە ئەو دوو دەوڵەتەی دوایی لەناو شەڕدا دەژین و وا وینا دەکرێن، کە لەوانەی تر لاواز ترن، بەلاّم دەبێت درک بەو راستیە بکەین، کە لەماوەی 10 ساڵی رابردوودا لە بەهێزترین قۆناغی خۆییاندا دەژین!. ئێستا تورکیاو ئێران بوونەتە دوو ئیمپراتۆریاو لەسەر تەختەی شانۆی نێودەوڵەتی جێگای خۆیان گرتووە. سوریا وا خەریکە زیندوو دەکرێتەوەو دەسەلاّتی رژێمەکەی ئەسەد گەڕێنراوەتەوە بۆ بەشێکی زۆر وڵاتەکەی، ئەمە وادەکات رۆژئاوا لە مەترسیدا بێت و نۆرەی بۆ شەڕێکی گەورە گرتبێت. ئەوەی پەیوەندی بەئیراقەوە هەیە نابێت بەو فەوزایە رووکەشەوە فریو بخوێن، کە ئێستا ئەو وڵاتەی گرتۆتەوە، چونکە لەژێرەوە زۆر بەجدی کار بۆ بەهێزکردنەوەی ئێراق دەکرێت و سالانە بای ملیاران دۆلار چەک دەکڕێت، دەبێت چاوەروانی ئەوە بکەین، لەپڕ گۆڕانکاریەک رووبدات و سەدامێکی تر بهێنرێتەوە سەر جلّەوی دەسەلاّت، ئەو کاتە چاوەروانی هەلەبجەو ئەنفالی تر بین. بەکورتی دەمەوێت ئاماژە بەوە بکەم، کە پێوستە لەو قۆناغە هەستیارو ترسناکەدا ئاوەزمەنداتر مامەڵە لەگەل ململانێکان بکەین و زیاتر لە بەرپرسیاریەتیەکە تیبگەین و هەموو توانایەک بۆ بەیەکەوە کۆکردنەوەی هێزە شەرکەرو رکابەری کوردی بخەینە گەڕ.

## تورکیا لەداگیرکاری ئابووریەوە بۆ داگیرکردنی سەربازی

2021\5\3

ماوەیەکی زۆرە تورکیا لەرووی ئابووریەوە بەشێکی گرنگی هەرێمی کوردستانی داگیر کردووە، ئەو کەسەی سەردانی بازاڕەکان بکات، هەر لەکڕینی پارچە کێکێکەوە بۆ منالەکەی تا دەگاتە جل و بەرگ و جوانکاری و دەرمان و شامپۆو سابوون،و کەل و پەلی بیناسازی... هتد، بەئاسانی بۆی دەردەکەوێت، کە ئەو ولاتە چۆن لەرووی ئابووریەوە داگیر کراوە، جیاوازی شارەکانی هەرێم لەگەڵ شارەکانی تورکیا لەوەدایە ئەو کەل و پەلانەی تورکیا لێرە ساخیان دەکاتەوە، کەل و پەلی چرووک و بارگاوی کراون بە دەیان جۆر نەخۆشی ترسناک، ئەگینا لەرووی رووخسارەوە، رەنگ بێت بازاڕەکانی شارەکانی هەرێم هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ بازاڕەکانی شارەکانی تری تورکیا نەبێت!. تەنانەت ئەو کارە خێرخوازیانەی حزبەکانیش وەک کارێکی ریاکاری پێی هەڵدەستن، کەل و پەلی تورکین و مۆرو ئالای تورکیایان بەسەرەوەیە!. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە هەرێم لەرووی ئابووریەوە بەتەواوی کۆنترۆڵکراوە، ئەو داگیرکاریە ئابووریە بەتەنیا لە دەڤەری زەردی نەگرتۆتەوە بەڵکو دەڤەری سەوزیشی گرتۆتەوە، دەشێت لەرووی قەبارەی داگیرکاریەوە لەئاستی هەولێرو دهۆک نەبێت، بەلام جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ ئەو ناوچەیەدا نیە، کەواتە داگیرکاری ئلبووری تورکیا بەسەرکەوتوویی پەڕیوەتەوە ناوچەی سەوزیش.

لەداگیرکاری ئابووری مەترسیدارترین ئەو شەڕە دەروونیەیە، کە
تورکیا لەرێگای میدیا بەناو کوردیەکانەوە لەگەڵ تاکی کوردی دەیکات،
جێگای داخە زۆرینەی میدیای کوردی بە نەزانی بێت یاخود زۆرزانی،
تەنیا بەناو کوردین و لەناوەڕۆکەوە میدیایەکی تورکین و پڕوپاگەندە بۆ
کاڵاکانی تورکیاو شێوازی ژیان لە تورکیا دەکەن، ئەمە وایکردووە تاکی
کورد لەناخەوە داگیر بکرێت و هەست بەهیچ نەکات، بۆ نمونە ئێستا
تورکیا گەورەترین پڕۆسەی داگیرکاری سەربازی لەهەرێم ئەنجام
دەدات، تاکی کوردی لەباشوور وەک ئەوەی نەبای دیبێت نەباران بێدەنگ
لێی دانیشتووەو متەقی لێوە نایەت!. راستە ئەمە کاریگەری هەڵوێستی
شەرمنانەو تەنانەت خیانەتکارانەی حزبەکانی پێوەیە، بەڵام دەبێت تاکی
کوردیش لەوە تێبگات ئەو داگیرکاریە سەربازیە، کە هەموو دەرگاکانی
بۆ خراوەتە سەرپشت و رێگاکانی بۆ خۆشکراوە، چارەنوسی ئەو
دەگۆڕێت و ماوەیەکی تر ئەگەر ئەجێنداکانی تورکیا سەربگرێت، ئەوا لە
وڵاتەکەی خۆیدا نامۆ دەبێت و سەرەو ژێری خاکەکەی لەرەگەوە
دەگۆڕدرێت. دەبێت درک بەوە بکەین، کە ئێمە لەقۆناغێکی ئێجگار
هەستیاردا دەژین، وڵاتێک وا خەریکە سووتماک دەکرێت، کەچی نە
خەڵکەکەی خۆی و نە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دەنگیان لێوە نایەت، چ
شەرمەزاریەکە بۆ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی سوپایەکی دڕندەی وەکو
تورکیایان بەرداوەتە خاکی کوردستان، تەنیا بۆئەوەی بەرژەوەندیە
ئابووری و ستراتیژیەکانی خۆیان بەدیبێنن، ئەوا گریمان تورکیا لەرووی
سەربازیشەوە هەرێمی داگیر کرد، چ گەرەنتیەک هەیە بۆئەوەی هەرێمی
لێ بە باڵکان و نەکرێت و سەری نەخوات، ئەو حزبانەی ئێستا بوونەتە

پەیژەیەک بۆ داگیرکردنی کوردستان، دەبێت دڵنیابن دوای داگیرکردنی سەربازی هەڵوێستیان بەو شێوەیە نابێت و ناتوانن چیتر وەک هێزێکی نیشتمانی خۆیان نیشانی خەڵکی کوردستان بدەن بەردەوام بن لەفریودانی کۆمەلگای کوردی، بەڵکو بەچاوی موستەشارو جاشەکانەوە سەیردەکرێن و نەوەی نەوێ قۆناغێکی تر لە خەباتی رزگاری دەستپێدەکاتەوەو ئەوانیش دەکەونە زبڵدانی مێژوو.

# ئەوانەی مامۆستام بوون و ئەوانەی هەرگیز نەیانتوانی ببنە مامۆستام

2021\5\11

مامۆستا بە تەنیا ئەو کەسە نیە، کەوا لە شوێنیک لەشوینەکان و رۆژێک لە رۆژەکان دەرسیان پێگوتویت، بەڵکو مامۆستا ئەو کەسەیە، کە شتێکی لێوە فیر بوویت و کاریگەریەکی ئەرینی لەسەر ژیانت کردووە، زۆرن ئەوانەی لە هەرێمی کوردستان نازناوی دکتۆرو پرۆفیسۆرو لەکۆتایدا مامۆستایان هەڵگرتووە، بەڵام زۆر کەمن ئەوانەی بەکردەیی مامۆستان و کۆمەلگا شتیان لێوە فێر دەبێت و کاریگەریان هەیەو دەبێت. جێگای داخە وەک چۆن لە هەرێمی کوردستان حزب هەموو کایەو بەهاکانی کۆمەڵگای چرووک و بێبەها کردووە، بڕوانامەی دکتۆری و تەنانەت ئێستا وا خەریکە پلەی زانستیش چرووک بێبەها دەکات، بۆیە کایە ئەکادیمی و پەروەردەییەکان لە ئێستادا ڕێک رۆڵی پێچەوانەی خۆیان دەگێڕن و کۆمەڵگا زیاتر بەرەو نەزانین و گەمژەیی دەبەن، لەجیاتی ئەوەی هەوڵبدەن حزبەکان و کۆمەڵگایەکانیان بگۆڕن، رێک کەلتووری بەناو حزبە دواکەوتوو و نا نیشتمانیەکانیان هینانەوە ناو زانکۆکان بوارە مەعریفیەکانی تر. جێگای داخە ئەمڕۆ زانکۆ قوتابخانەو کایە مەعریفیەکانی بەڕێیوە دەبەن، نەک نوینەرایەتی هزری داهێنانەکان ناکەن، بەڵکو ئەوانە بوونەتە بارێکی زۆر گران بەسەر کۆمەلگاو لەقۆناغێکی دواکەوتووییەوە بۆ دۆزەخێکی تری دوا کەوتوویی دەبات.

ئەوانەش، کە بەرکردەیی دەتوانن بەرپرسیاریەتی ئەو قۆناغە هەلگرن و لە ئاستی پیشەو کارەکانی خۆیاندان، نەک هەر دوورخراونەتەوە، بەلکو لەلایەن ئەو نەخویندەوارەی ئەو حزبانەی ئەو نەخویندەوارانەشی پێگەیاندووە، کێشەیان بۆ دروست دەکرێت پشنگوێ خراون!.

کێشەی گەورە لەنێو ئەو کایەنەدا لەکوردستان بە تەنیا لایەنە مەعریفی و زانستیەکە نیە، بەڵکو بەهاو ئەتیکای ئەکادیمی و پەروەردەییە، لەناوچەو کۆمیتەو لق و مەڵبەندەکان، سەدان نەخوێندەواریان خستۆتە ناو زانکۆکان و جلی دکتۆرو پرۆفیسۆرو مامۆستایان لەبەر کردووە، ئەو کادیرە نەخوێندەوارو هەلپەرستانە وەکو ناوچەو کۆمیتە لەناو زانکۆکان و کایە پەروەردەییەکانی تر رەفتار دەکەن و ژیگەی مەعریفەو نەخویندەواری و جەهالەتی حزبەکانیان لێ تێکەڵ بووە، بەشێوەیەک سەریان لێشێواوە، بەڕاستی خۆیان وەک دکتۆرو پرۆفیسۆرو زانا دەبینن، لەکاتێکدا ئەوانە جگە لەهەڵگری کەلتوورێکی سەقەتی بەناو حزبایەتی لەکوردستان نین، هیچ پەیامێکی نە زانستی نە ئاکاری زانستی و نە ئاداب و ئەتیکای زانستیان هەلنەگرتووە، پیرۆزیەکان و ئمانەتەکانی ناو زانکۆکانیانیان بێبەها کرد، وەک بابەتێکی بازرگانی مامەڵە لەگەڵ دەرس و نمرەو تافیکردنەوەو لیژنەی بەناو زانستی و تاقیکردەوەکان دەکەن، ئەو دێوە زمانەی سەر ملی زانست هەموو شتە ناشرینیەکانی ناو حزبەکانیان هیناوەتە ناو زانکۆکان و بە ئادابێک بارگاری کراون، کە جووتیارو نەخویندەوارێکی رەسەنی ئەو کوردستانە، ئاکارو بەهاکان و ئاستی هوشیاری و زانستی و هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی نیشتمانی زۆر لەوانە بەرزترە!.

هەر کاتێک لە حزبەکانیان تڕۆ دەکرێن، دەبنە رەخنەگرو دڵسۆزی خەڵک، هەرکاتێک حزبەکانیان ئاوڕیان لێدەداتەوە وەکو کۆیلەیەک دەکەونە گیانی ئازادیەکان و ترسنۆکانە پێ لە هەموو تەختەیەکی چرووک دەنێن. نمونەی لەو بابەتەم زۆر دیوە، زۆرجاران دێنە لام و رەخنە دەگرن و وەک ئۆپۆزسیۆنێک و دڵسۆزێک و بەرگریکارێکی سەرسەختی خەڵک خۆیان نیشان دەدەن، دوای ئەوە هەر خۆیان، کە دەکەونە رێز نەخوێندەوارەکانی ئاوکووفی خۆیان، لەپێش ئەوان بوێری ئەوەیان نابێت سڵاوێک بکەن. ئەوانەی، کە هۆکاری گەندەڵێن و ئاستی ئەکادیمی و پەروەردەیان لە هەرێمی کوردستان بەمرۆ گەیاند، هەر ئەوانە لە هۆبەو پۆلەکاندا گلەیی دەکەن و رەخنە لەدۆخی زانستی هەرێمی کوردستان دەگرن!.

جێگای داخە ئەوانەی، کە لەمیسرو تورکیا و قوبرس و لوبنان و ئێران، لە هەولێرو سلێمانی و دهۆک و هەموو زانکۆکانی تری هەرێم، لەکاودانێکی پڕ تەمومژو گوماناویەوە گوایە خوێندوویانەو وەک زۆر کەس لەوانە راشکاوانە دانی پیا دەنێن، بڕوانامەیان بەپارە کڕیوە، لەگەڵ رێزم بۆ ژمارەیەکی کەمی مرۆڤە زانستخوازو دڵسۆزەکانی ئەم کۆمەڵگایە، ئێستا دەستیان بەسەر زانکۆو بوارە ئەکادیمیەکان داگرتووە، ئێستا واخەریکە هەمووش دەبنە پرۆفیسۆری یاریدەدەرو پرۆفیسۆرو خاوەن نازناوی گەورە گەورە، کە لەبنەڕەتدا ئەو نازناوانە هیچ پەیوەندیەکی بەوانەوە نیەو لێیان بێبەریەو خودی نازناوەکە لەناخی خۆیدا شەرمەزاریەکی گەورەی بە تەوێلی ئەوانەوە لکاندووە. وەک قوتابیەکی خۆم، کە لەمیسر دەیخوێند بۆی باسکردم، کە چۆن دکتۆرێک

داوای لێکردووە ئەکادیمیەکی لەمیسر بۆ بدۆزێتەوە بۆئەوەی سێ توێژینەوەی بۆ بنووسێت و لە گۆڤارێکی ئەکادیمی پلەبەرز بۆی بڵاو بکاتەوەو چەندی تێبچێت گرنگ نیە!. یەکی تر هاتە لام دوای ئەوەی بەشان و باڵمی هەڵداو هەزار رەخنەو گلەیی لەزانکۆو ئەتیکاو ئاستی مەعریفی زانکۆ گرت، هەر خۆی لەپێش خەڵک لیم رادەکات و وانیشان دەدات، کە نامناسێت، نەوەک بەهۆی منەوە بەر غەزەبی حزبەکەی بکەوێت و بەرژەوەندیەکانی بکەوێتە مەترسیەوە، ئای زانکۆکان چۆن پڕ بوون لەو مرۆڤە چرووک و بوودەڵانەو هەموو بەهایەکی ئەو کۆمەڵگایەیان بن پێ خستووە، ئەی چەند زۆرن ئەوانەی بەسەقەتی پەروەردەکراون و وەکو رەفیق حزبیەکانی سەردەمی بەعس، زۆر چرووکتریش لەناو زانکۆکان رەفتار دەکەن و وا دەزانن لە کۆمیتەیەک یاخود ناوچەو لقێکی حزبیدا کاردەکەن. ئای زۆرن ئەوانەی لە تەمەنی خوێندنمدا دەرسیان پێگوتووم و مامۆستام نین، ئەی چەند زۆرن ئەوانەی نە پرۆفیسۆرن و نەدکتۆرن و نەمامۆستان و نە خوێندەواریان هەیە ، کە من زۆر شتیان لێوە فێر بووم و  بە مامۆستای راستەقینەی خۆمیان دەزانم.

## کوردو جولەکەو ئیسلامییەکان
## کۆمەڵێک پرسیاری کۆمۆتراتژیدی ئامێز!

2021\5\15

تورکیا هێرشێکی گەورەی بۆ سەر هەرێمی کوردستان دەستپێکردووە، بەئاگرو ئاسن گوندو چیاو دۆڵەکانی کوردستان بۆردومان دەکات، تەنانەت وەک سەرچاوەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان ئاماژەی بۆ دەکەن، چەکی قەدەغەکراوی نێودەوڵەتی لەنێویشیاندا چەکی کیمیایی بەکاردەهێنێت، کەچی زۆرینەی کۆمەڵگای کوردی وەک ئەوەی نەبای دیبێت نە باران!.

ئەوەی جێگای سەر سوڕمانیە حکومەتی هەرێم، کە خۆی بەخاوەنی ئەو هەرێمە دەزانێت، نەک بێدەنگە، بگرە بەراشکاوانەو راستەوخۆ پارتی کرێکارانی کوردستان تۆمەتبار دەکات و ئەمەش واتای ئەوەیە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەرووی راگەیاندن و بەشێوەیەکی راستەوخۆش لەرووی هەواڵگری و پرۆسەی سەربازیەوە هاریکاری تورکیا دەکات، کۆمۆتراژیدیاکە لەوە دایە پەکەکەش تۆمەتبار دەکات، کە کێشە بۆ هەرێم دەنێتەوە!؟ ئەگەر دەڵێن ئەوە بە تەنیا پارتیە هاریکاری تورکیا دەکات، ئەمە چەواشەکردنێکی میدیاییە، لەبەرئەوەی یەکێتی و گۆڕانیش هاوبەشن لەو حکومەتەو بەچاک و بەخراپ لەم هەڵوێستە بەشدارن. لەمەش سەیرتر بەرپرسەکانی حکومەتی هەرێم فرمێسک بۆ منداڵە فەلەستینیەکان دەڕێژن و لەکاتێکدا خۆیان شان بەشانی تورکیا منداڵی کورد تیرۆرو بێباوک دەکەن و لە کونجی زیندانەکانیان دەئاخنن و باکیان نەک بەفرمێسک بەڵکو بەخوێنی منداڵانی کوردیش نیە!.

بەراستی سەیرە وڵاتەکەت داگیر بکرێت، کەچی شین و واوەیلا بۆ خەڵکی تر بگێڕیت. لە دەسەڵاتی کوردی دووڕووتر بەناو

ئیسلامیەکانی کوردستانن، کە خۆیان بە بانگخوازو چاکەخوازو ....هتد نیشانی خەڵک دەدەن و فرمێسک بۆ ئیسلام دەڕێژن، لەکاتێکدا خۆیان لەهەموو کەسێک زیاتر ئاینی ئیسلامیان چرووک بێبەها کردووەو بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان بەکاری دەهێنن، ئەوانیش، کە لەسەر مینبەرو بڵندگۆکان، لەسەر بچووکترین کێشەی ناو کۆمەڵگا قسە دەکەن و جنێو بەدارو بەرد دەدەن، بەرامبەر هێرشی تورکیا بوونە بەتەڵەی تەقیوو راشکاوانە دەستخۆشی لە ئەردۆگان دەکەن و بەسوارچاکی رزگارکردنی فەلەستینی لەقەڵەم دەدەن!. تورکیا پێنج شاری باکووری کوردستانی وێران کرد، لەبەرچاوی میدیاکان زرێپۆشەکانی تورکیا ئافرەت و منداڵی کورد دەشێلێت، کەچی ئەو بەناو مرۆڤ دۆستە ئیسلامی و عەلمانی و رۆشنبیرو جاهیل و خوێندەوارو نەخوێندەوار نقەیان لێوە نایەت!.

ئەمە بەشێوەیەک لەشێوەکان دووپاتکردنەوەی ئەو هەلوێستە پڕشەرمەزاریەی دەولەتە ئیسلامیەکانە بەرامبەر کوردو داننانە بەو دەنگە ناسازو پڕ جەهالەتەی ئیسلامیە عەرەبەکان، کە کورد بەخێوو جنۆکەو کافر لە قەڵەم دەدەن، ئەی ئەگەر ئیسلامیەکانی کوردستانیش کوردیان لا موسڵمان بێت، بەلایەنی کەم دەبوایە تنۆکە فرمێسێکیشیان بۆ میللەتەکەی خۆیان بڕشتبوایە، ئەوان ناڵێن کەسە نزیکەکان زیاتر شایەنی چاکە لەگەڵ کردنن!. ئەی بۆ دوورو نزیک بەرامبەر ئەو هەموو تاوانەی ئەردۆگان بەرامبەر میللەتەکەیان دەکات نیوە قسەیەکی خێریش بۆ گەلەکەیان ناکەن!؟. ئەوان لەکاتیکدا لەسەر مینبەرەکان فرمێسک بۆ سەربازە کوژراوەکانی تورکیا دەڕێژن، کە دەستدرێژیکارن و پەلاماری خەڵکی بێوەی و موسڵمانیان داوەو ژن و منداڵ و خاک و وڵاتی گەلێکی موسڵمانیان هەتک کردووەو بەگوێرەی خودی ئاینی ئیسلام شوێنیان ناوەڕاستی دۆزەخە، بۆ دەنگێکی کزیشیان لێوە نایەت!؟ بۆ نووزە لاواندنەوەیکیش بۆ ئەو کچە گەنج و قارەمانانە ناگێڕن، کە بەرگری

لەناموس و مافی گەلەکەی خۆیان دەکەن و ئەو سەربازانەی ئەوان بۆیان دەگرین، لەبەرزەقەی چاوی میدیاکان دەستدرێژیان دەکەنە سەرو بە ناڕەوا خوینیان دەڕێژن و تیرۆریان دەکەن!

ئایا ئاستی نەخوێندەواری و جەهالەتی گەیشتۆتە ئەو رادەیە نەزانن گەلی فەلەستینی وەکو گەلی کورد کراوەتە قوربانی دەست هێزە ئیسلامیەکان و دەسەڵاتدارە گەندەڵەکان، ئایا نازانن ئەوە ئەو هێزە ئیسلامی و دەسەڵاتە گەندەلەکانی عەرەب و تورکە بازرگانی بەو شەڕو خوێن رشتنە دەکەن و لەسەر حیسابی خوێنی مندالە فەلەستینیەکان کۆشکی بەرزو تەلاری گەورە لە وڵاتە کافرەکان بۆ مندالەکانیان دەکڕن و بونیات دەنێن و خەڵکی سادەی موسڵمانی پێ فریو دەدەن!. ئایا ئەوە ئەو دەسەڵاتدارە ئیسلامیە گەندەلانە نین، کە یاری بە چارەنوسی مندالە فەلەستینی و جولەکەکان دەکەن و یارمەتی گەشەسەندن و بەهێزبوونی جوولانەوەی زایۆنیزم دەدەن!؟ ئایا نازانن ئەگەر کێشەی فەلەستین و ئیسرائیل چارەسەر بکرێت، ئەوان لەسەر مینبەرەکان چۆن بشیرێنن و دەسەڵاتدارەکان پاساو بەچی بۆ رژێمە ناڕەواو گەندەڵگارەکانیان بێیننەوە!؟

کامە دەسەڵاتداری عەرەبی هەیە لەژێرەوە، دیارە لە ئێستادا بەئاشکراتر، پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل نەبێت و لەسەرەوەش جنێوی پێنەدات!. ئایا نازانن ئەردۆگانی رزگارکەری قودس گەورەترین بازرگانی لەگەڵ ئیسرائیل هەیە و هاوپەیمانی تورکی – ئیسرائیلی یەکێکە لە هاوپەیمانیە بەهیزەکانی ناوچەکە!؟ ئایا ئەمە هەمان ئەو فرمێسکە تیمساحیە نیە، کە بۆ سوڵتان عەبدولحەمیدتان دەڕشت، کە لەسەرەوە دژی جولەکە دەوەستاو لەژێرەوەش دەیان ئاکنجی و ناوچەی دەفرۆشتە جولەکەکان!؟، ئایا ئەو دۆکیومێنتانەتان نەخویندۆتەوە، کە سوڵتان عەبدولحەمید زەویەکانی فەلەستینی چۆن دەفرۆشتە جولەکەکان!؟، ئایا ئەمە واتای ئەوە نیە، کە سوڵتان عەبدولحەمید خۆی دامەزرێنەری

راستەقینەو دانەری بەردی بناغەی ئیسرائیلە نەک بەریتانیەکان و بەڵێنی بەلفۆر وەک خەڵکی پێ فریو دەدەن!؟

دیارە لەمەدا مەبەستم پاکانە کردن نیە بۆ ئینگلیزەکان، کە هۆکاری سەرەکی ماڵوێرانی زۆربەی گەلانی رۆژهەڵات و بەرپرسی یەکەمی دابەشکردنی کوردستانن لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی، بەڵکو دەمەوێت تەنیا چەند راستەقینەیەکی تاڵی مێژوویی روونبکەمەوە. ئەگەر تۆ نەتوانیت رێزی میللەتەکەی خۆت بگریت، پیت وایە خەڵکی تر، هەرچەندە کۆیلایەتیشیان بۆ بکەیت ریزی تۆ بگرن!؟ لەمێژوودا هیچ کۆیلەیەکت دیوە لەلایەن خاوەنەیەکەوە ریزی لیگیرابێت!؟ هیچ داگیرکەرێکت دیوە رێزی ئەو کەسانەی گرتبێت، کە پەلکێشیان کردووە بۆئەوەی وڵاتەکەیان داگیر بکات!؟ چۆن چاوەڕوان دەکەی میللەتانی تر رێزی تۆ بگرن، لەکاتێکدا تۆ درۆ لەگەڵ خۆت و ئاین و بیروباوەڕەکەت دەکەیت!؟ بەراستی بە هەموو ئاوەزی خۆتان پێتان وایە ئەردۆگان وەک برا موسڵمانێک سەیرتان دەکات، یاخود وەک جاش و خۆفرۆشێک؟! ئایا لەخۆتان نەپرسیوە، ئەردۆگان لەکاتێکدا خۆی بە زیندووکەرەوەی ئیپمراتۆریای عوسمانی دەناسێنێت و کار بۆ ئەوەش دەکات خۆی وەک یەکەم ئیمپراتۆری عوسمانیە نوێیەکان بچەسپێنێت، بۆچی هاوپەیمانی سەرەکی تورکە عەلمانی ناسیونالیستە توندڕەوەکانە (MHP)!. ئایا لەکاتێکدا، کەمالیستەکان بەماسۆنیەت تۆمەتبار دەکەن، هیچ بۆنی ماسۆنی بوونێک لە ئەردۆگان ناکەن، ئایە خۆتان وەک بەرهەمی فریودانێکی مێژوویی نابیننەوە!؟.

کاتێک سوپای عوسمانیە نوێیەکان بە یارمەتی ئیسرائیل و ئەمریکاو ناتۆ و روسیا، عەفرینی داگیر کرد، زیاتر لە 95 هەزار مزگەوتی تورکیا سورەتی فەتحیان خوێندو دوعایان بۆ ئەو داگیرکاریە کرد، ئایا کوردەکانی عەفرین کافر بوون!؟. چەند مەلاو بانگخوازو زانا نەخوێندەوارەکان یەک قسەی خێریان بۆ عەفرین کردو ئەوانیش لە

مزگەوتەکان دژی ئەو زوڵم و داگیرکاریەی تورکیا بوونەوەو دوعایان بۆ سەرکەوتنی میللەتەکەیان کرد بەرامبەر ئەو زوڵم و دەستدرێژیە!؟. بەراستی جێگای شەرمەزاریە کۆمەڵگای کوردیتان گەیاندە ئەو رۆژە، ئاینی ئیسلام و نەتەوەو خواو پێغەمبەر لەئێوە بێبەریەو واز لە فریودانی ئیسلام و خەڵکی سادەی کوردستان بێنن، کورد لەمێژە گوتویەتی سەد ساڵ بکەی بێگانە پەرستی دوایی چارەنووسەکەت دیارو روون و ئاشکرایە.

دڵنیا بن من لاریم لەوە نیە فرمێسک بۆ فەلەستین دەرێژن، لەبەرئەوەی منیش نەک بە تەنیا بۆ فەلەستین بەڵکو فرمێسک بۆ هەموو مرۆڤێکی زولم لێکراو دەرێژم لەسەر ئەو گۆی زەویەو جیاوازی لەنێوان رەگەزو ئاین و نەتەوەو رەنگی پێست ناکەم، بەڵام چ واتایەکی هەیە بۆ خەڵکی تر فرمێسک برێژی و بۆ نەتەوەکەی خۆت بێدەنگ بیت!؟ ئایا کوردیش مرۆڤ نیە، چ درۆیەکی گەورەیە خەڵکی ترت پێ مرۆڤ بێت و نەتەوەو کۆمەڵگاکەی خۆت پێ مرۆڤ نەبێت!. جێگای داخە ئێوە خۆتان وەک رەخنەگرو چاکسازیخوازو فریشتە نیشان دەدەن، لەکاتێکدا زۆر لەو دەسەڵاتە گەندەڵترن، کە رەخنەیان لێدەگرن!. هیوادارم بگەرێنەوە سەر راستەقینەی ئاینی ئیسلام و چیتر خەڵک فریو نەدەن و کەمیک رێزی هەست و سۆزی میللەتەکەی خۆتان بگرن.

## پێویستە خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستان لە بیر نەکرێن

**2021\5\19**

خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستان لە دۆخێکی ئابووری و سیاسی خراپدا دەژین، هەرچەندە دۆخی هەرێمیش وەکو پێویست لەبار نیە، بەڵام هەرگیز لەگەڵ رۆژهەڵات بەراورد ناکرێت، بۆیە پێویستە دەسترۆیشتوو و سەرمایەدارەکانی هەرێم باروبووی کوردانی رۆژهەڵات بکەن و یارمەتیان بدەن، بە تایبەتیش ئەوانەی هاتوونەتە هەرێم و لێرە کار دەکەن، ئەگەر هەر نەبێت کاریان بۆ بدۆزنەوەو لە کۆمپانیاو کارگەکانی خۆیان دایانمەزرێنن. ناکرێت هەموو دەستەوەستان دانیشین و گەنجانی رۆژهەلات ئاگر لە جەستەی خۆیان بەر بدەن، ئەمە سپڵەیی و نمەک حەرامیە، هەمووومان لە یادمانە، کە دوای کۆڕەکە خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستان بە چ گیانێکی نەتەوەییەوە بە پیر باشوور هاتن و لە تارکتترین چرکە ساتەکاندا نەیانهێشت بکەون، بەلایەنی کەم پێویستە ئەو چاکەیەیان بدرێتەوە، هەرچەندە ئەمە ناکەوێتە دوو توێی چاکەو پیاوەتی و بەڵکو ئەرکێکی نیشتمانی و نەتەوەیی و مرۆڤایەتیە، داوا لەرێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی دەکەم هەموو بەیەکەوە دەستەیەکی دەستپاک کۆبکەنەوەو ئەو ئەرکە بەجێبەجێبگەیەنن، ئێمەش لای خۆمان لە هەموو رووێکەوە پاڵپشتیان دەکەن، کاتی ئەوە نیە فرمێسک برێژین و شین و شەپۆڕ بۆ گەنجەکانیان بکەین، بەڵکو کاتی ئەوەیە بەکردەیی قۆڵی لێهەڵماڵین و لە چرکەساتێکی پڕ نائومێدیدا ئومێد بەبەر خەڵکی رۆژهەڵات

بکەینەوەو هەڵوێستێکی مێژوویی تۆمار بکەین، کە ئەمەش سەرباری پڕکردنەوەی بەشێکی کەمی پێویستیەکان، گیانی یەکگرتن و یەکڕێزی نێوان کوردان بەهێزتر دەکات و سەرەتایەک دەبێت بۆ هەنگاوی راست و تەندروست، با ئێمە وەکو کۆمەڵگەی باشوور بەو کارە هەڵسین و چیتر چاومان لە بازرگانە سیاسیەکانی کوردستان نەبێت، دڵنیام خەڵکی کوردستان لە باشوور بە دەم ئەو دەستپێخەریەوە دێت و سەرمایەدارو خوا پێداوی وامان هەیە لە ئاستی بەر پرسیاریەتی خۆیاندا بن.

## پەیوەستە جیۆپۆلەتیکیەکانی ئەفغانستان و کوردستان و ڕەنگدانەوەی لەسەر سیاسەتی ناوچەکە

## (1)

2021\7\15

ئەفغانستان سەرەتا خاڵی ئەو نیوکەوانەیە، کەوا درێژ دەبێتەوە تا ئێراق و لەرێگای کوردستانەوە سنوورەکانی باشووری روسیا ئابڵووقە دەدات، کاتێک ئەمریکا وناتۆ لەساڵی 2002 ئەفغاستانیان داگیرکرد، هەر ساڵیک دوای ئەوە ئێراقیشیان داگیر کرد، بەم چەشنە دروستکردنی نیوکەوانەکەیان تەواو کرد، هاوکات ئەفغانستان بۆ روسیا ئەو دەروازەیەیە دەیگەنێتە ئۆقیانووسی هیندی، کاتێک لە حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا، دوای ئەوەی کۆمەڵێک رژێمی لایەنگیری رۆژئاوا هاتنە سەر دەسەلآت، یەکێتی سۆڤیەت بۆ کردنەوەی ئەو دەروازەیە سەرەڕۆییەکی جیۆپۆلەتیکی ئەنجامداو پەلاماری ئەو وڵاتەی دا، کە ئەمە قوڕ ولیتەیەکی سەخت بوو بۆ سۆڤیەت ئامادە کرابوو نەیتوانی لێی دەربچێت تا ئەو کاتەی هەڵوەشایەوە.

دوای داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن ئەمریکا وناتۆوە، روسیا شیلگیرانەتر کەوتە کار بۆ کردنەوەی ئەو دەروازەیە، تەنانەت وەک سەرۆکی روسیا راشکاوانە رایگەیاند، بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو

هەڕەشانە ئامادەیە چەکی ئەتۆمیش بەکاربێنێت، دوای ئەو هەنگاوە ململانێکانی روسیا و رۆژئاوا لەهەموو سنوورە جیۆپۆلەتیکیەکانی روسیا قوولترو چڕتر بووەوە، هەر لەناوچەی باڵکانەوە تا دەگاتە ئەورووپای رۆژهەڵات ودواتریش ئۆکرانیا، دوای ئۆکرانیاش ململانێیەکە لەسالی 2015 پەڕیەوە سوریا.

ئەم هەڵوێستە توندەی روسیا رادەیەکی بۆ هەژموونی ئەمریکا دانا، لەساڵی (2017) بەشێوەیەکی کردەیی شەڕێکی تری سارد لەنێوان ئەو دوو بەرەیەدا داگیرسایەوە، کە بووە هۆی پاشەکشەی سیستەمی تاکجەمسەری ئەمریکا، بەشێوەیەک لەئێستا هەنگاوی پاشەکشەی جیۆپۆلەتیکی ئەمریکا وناتۆ بەکردەیی دەستیپێکردووە، بۆ نمونە دوای نزیکەی بیست ساڵی لەداگیرکردنی ئەفغانستان ئەو وڵاتەی دایەوە دەست بزووتنەوەی تالیبان، کە بە بزووتنەوەیەکی تیرۆریستی ناساندبوو!

ئەمرکیا بەم هەنگاوە دەوێت دۆخەکە بگەڕێنێتەوە بۆ هەشتاکانی سەدەی بیستەم ولەجیاتی ئەوەی ئەو هەموو توانایەی خۆی لەو ناوچەیە بە هەدەر بدات، دەخوازێت لەرێگای وەکیلەکانیەوە (تالیبان) هەمان کێشە بۆ روسیا دروست بکاتەوە، بەتایبەتیش ئەگەر ئەوەمان زانی ئەفغانستان هاوسنوورە لەگەڵ کۆمەڵێک دەوڵەتی ئیسلامی لە ئاسیای ناوەڕاست، کە زۆرینەی موسڵمانن وروسیا وەک خاڵی بێهێزی خۆی لەو ناوچەیە سەیریان دەکات!

لەسەر ئەو بنەمایە، ئەگەر کۆی کەوانە جیۆپۆلەتیکیەکەی نێوان ئەفغانستان وکوردستان وەربگرین، ئەوە دەبێت لەماوەیەکی کەمی

داهاتوودا، کە ڕەنگ بێت زۆر لەساڵێک تێپەڕ نەکات ئێراق و کوردستانیش جێبهێڵێت.

ئەمریکا ئەو ناوچەیە بۆ کێ جێدەهێڵێت؟ ئەگەر لەسەر بنەمای هەمان هەنگاوی ئەفغانستانەوە خویندنەوە بۆ دۆخی ئێراق بکەین، یەکێک لە ئەگەرەکان زیندووکردنەوەی داعش و هێنانە سەر دەسەلاتی هێزیکی سوونەی توندڕە و دەبێت، بۆئەوەی بەرەوڕووی ئێرانی بکاتەوە. ئەم هەنگاوە لەگەڵ بەرژوەندیەکانی تورکیاش یەکدەگرێتەوە، لەبەرئەوەی تا ئێستاش ڕێکخراوی داعش وەک هێزی سەربازی عوسمانیە نوێیەکان سەیر دەکرێت! کەواتە باکووری ئێراق بۆ تورکیا جێبهێڵرێت وناوەڕاستیش بۆ سوونە بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی هەژموونی ئێران ببێتەوە لەناوچەکە، هێندەی پەیوەندی بەباکوورەوە هەیە، تورکیا لەڕووی سەربازیەوە داگیرکردنی ئەو ناوچانەی تەواو کردووەو لەسەر سنوورەکانەوە تا دەگاتە ناوچەی زینی وەرتێ، کەناوچەی ناوبڕە لەنێوان قەڵەمڕەوی ئێران وتورکیا، قەڵای لە لوتکە شاخە بەرزو ستراتیژیەکان دروست کردووەو خەریکە بۆ دەڤەری سەوزیش دەپەڕێتەوە، ئەو ململانێیەی ئێستا لەناو یەکێتی نیشتمانی ڕوودەدات بەشێوەیەک لە شێوەکان دەرهاویشتەی ئەو گۆڕانکاریانەیە...

**(2)**

2021\7\23

دۆخەکە بەرەو کوێ دەچێت؟

وەک ئاماژەی پێکرا، یەکێک لە ئامانجەکانی کشانەوەی ئەمریکا لە ئەفغانستان دروستکردنی کێشەیە لە ئاسیای ناوەڕاست، واتە لە ئایندەیەکی نزیکدا ئاڵۆزی وشەڕو شۆڕ دەکەوێتە وڵاتە ئیسلامیەکانی ئەو ناوچەیە، کە ئەمەش لەلایەک فشار دەبێت بۆ سەر روسیا، لەلایەکی تر دەبێتە هۆی بەهێزکردنی ئیگۆرە موسڵمانەکان لەچین! بە واتایەکی تر ئەو فشارەی ئەمریکا تەنیا روسیا ناگرێتەوە، کە ئەمەش چین وروسیا زیاتر لەیەکتر نزیک دەکاتەوە، وەک وەزیری دەرەوەی روسیا (سێرگی لاڤرۆڤ) گوتی پەیوەندیەکانی روسیاو چین گەیشتۆتە ئاستێک، کە پێشتر وێنەی نەبووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت هەڕەشەی ئەمریکا چین وروسیا زیاتر بەیەکەوە کۆدەکاتەوە، کە ئەمە کۆسپی گەورە بۆ ستراتیژی ئەمریکا لەو ناوچەیە دروست دەکات. هەرچەندە ئەمریکا لەسەر ئەو تەوەرە کار دەکات، کە ئەو ناوچەیە ناوچەی رووبەڕووبوونەوەی هەژموونی روسیا وچینە دەیەوێت بەرژەوەندیەکانی ئەو دوو وڵاتە لەو ناوچەیە رووبەڕووی یەکتر بکاتەوە وکێشەیان بخاتە نێوانەوە، بەڵام ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێت، لەپێناو وەستانەوە بەرووی مەترسیەکانی ئەمریکا، ئەو دوو وڵاتە بەشێوەیەک لەشێوەکان بەرژەوەندیەکانی خۆیان لەو ناوچەیە رێکدەخەن بەر لە دروستبوونی گرژی دەگرن!.

ستراتیژی ئەمریکا لەکشانەوەی لە ئەفغانستان بە هەر مەبەستێک بێت، ناتوانێت ئەوە بشارێتەوە، کە ئەمریکا لەرووی هێزەوە گەڕانەوە دواوەیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینیوەو سیستەمی تاکجەمسەری ئەمریکی ئەگەر بەکۆتاش نەهاتبێت لە قۆناغەکانی کۆتایی نزیک بۆتەوە. بۆیە ململانێیەکان لە هەردوو دیوی کەوانەی ئەفغانستان و کوردستان

چڕ دەبێتەوە، کە دەکاتە ئاسیای ناوەڕاست و قەوقازو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، واتە کێشەکان لە قیزگزستانەوە، کە هاوسنوورە لەگەڵ چین وئەفغانستان درێژدەبیتەوە بۆ ئۆزبەگستان و تورکمانستان ناوچەی حەوزی قەزوین و ئازەربایجان وگورجستان تا دەگاتە سەر دەریای ڕەش، بەمەش ئەمریکا دەیەوێت فشارەکانی لەسەر تاکە دەروازەی دەریایی روسیا لەسەر دەریای ڕەش لە نیمچە دورگەی کریم زیاتر بکات، هەرچی لە دیوی خوارەوەیە، واتە باشووری نیوکەوانەکە، ئەوە لە ئەفغانستانەوە درێژ دەبێتەوە بۆ ئێران و دواتر بۆ تورکیا. بەم چەشنە کوردستان لە رووی جیۆپۆلەتیکیەوە دەکەوێتە چەقی ئەو ململانێیە جیهانیە، کە لەدواجاردا بەشێکی زۆر لەو ململانێیانە لەسەر خاکی کوردستان یەکلایی دەکرێتەوە!.

ئەوەی ئێستا لە باشووری کوردستان دەگوزەرێت زەمینە خۆشکردنە بۆ کردنەوەی گۆڕەپانێکی نوێی شەڕ لە کوردستان، کە ئامانجی ئەو پرۆسەیە لەلایەک پرۆسەیەکی داگیرکاری نوێ وراستەوخۆ دەبێت لەلایەن هەردوو دەوڵەتی تورکیا ئێران، لەلایەکی تر دەستپێکردنەوەی گەڕێکی تر دەبێت لەشەڕیکی ناوخۆ، بەڵام ئەمجارەیان چوارچێوەی ئەو شەڕە باشووری کوردستان تێدەپەڕێنیت و ڕۆژئاوای کوردستانیش دەگرێتەوە!.

لیدوانێکی (ئاڵدار خەلیل) بەرپرسیکی ڕۆژئاوای کوردستان بە توندی پاڵپشتی ئەو خویندنەوەیەمان دەکات، کاتێک گوتی ئەگەر پارتی دیموکراتی کوردستان لەپاڵ تورکیا بچێتە ناو شەڕ دژی پارتی کرێکارانی کوردستان، ئەوا ئەوانیش لە ڕۆژئاوای کوردستان بێدەنگ نابن

ودەستەوەستان نامێننەوە، بۆ هەموو کەسێکیش روونە، کە پارتی ئێستا بەتەواوی لەلایەن تورکیا بە بارمتە گیراوەو ئیرادەی سیاسی خۆی لە دەستداوە، بۆیە چوون یاخود نەچوونی بۆ ناو هەر شەڕێک دژی پارتی کرێکارانی کوردستان بەهیچ شێوەیەک لە دەستی ئەودا نەماوە، بەڵام بۆئەوەی لەبەرپرسیاریەتی مێژوویی رابکات وبەتەنیا ئەو بەرپرسیاریەتیە هەڵنەگرێت، دەیەوێت وەکو نەوەدەکانی سەدەی بیستەم یەکێتی نیشتمانی کوردستان وئەگەر بۆی کرا حزبەکانی تری باشووریش پەلکێشی ئەو شەڕە بکات و لەژێر ناوی حکومەتی هەریمەوە شەرعیەت بەو شەڕە بدات!.

کەواتە لەو ماوەیەی دادێت گۆڕانکاریەکان گەرمتر وخێراتر دەبێت، پێویستە کورد خۆی لەو شەڕە بپارێزێت، چونکە کوردستان دەکەوێتە چەقی ئاژاوەیەکی یەکلایکەرەوەی هەرێمی فراوانەوە، کە رەنگ بێت لە کۆتایی مانگی هەشت وسەرەتای مانگی نۆی داهاتوو، واتە بەر لەدەستپێکردنی هەڵبژاردنەکان دۆخەکە لە بەغدا بتەقێتەوە وئەو ئاژاوەیە دەستپێبکات! کشانەوەی حزبی شیوعی و هێڵەکەی سەدر لە هەڵبژاردنەکان ئاماژەیەکی روونە بۆ ئەو پێشهاتانە، کاتێک بەغداش دەکەوێتە ئاژاوەوە، ئەو کاتە دەرفەت بۆ رێکخراوی داعش دەڕەخسێتەوە، کە ئێستا خەریکی کۆکردنەوەی خۆیەتی، سەرلەنوێ وەک یاریزانێکی سەرەکی بێتەوە سەر تەختەی شانۆی سیاسی و سەربازی ئەو ناوچەیە، ئەمەش واتای ئەوەیە سنوورەکانی باشووری کوردستان لەلایەن داعشەوە ئابلۆوقە دەدرێت، بەڵام رووبەڕووبوونەوەی هەرێم لەگەڵ داعش پێدەچێت تۆزێک دوا بکەوێت

تا ئەو کاتەی چارەنووسی بەغدا یەکلایی دەبێتەوە، بەڵام سنوورەکانی باکووری باشووری کوردستان، واتە لە سنوورەکانی ئیرانەوە تا دەگاتە سنوورەکانی سووریا، دەبێتە شانۆی رووداوەکان، رەنگ بێت تورکیا لە قۆناغی سێیەمی ئەو هێرشەی دەستی پێکردووە، لەلایەک بە هاوبەشی پارتی دیموکراتی کوردستان پەلاماری شەنگال بدات، بۆئەوەی رۆژئاوای کوردستان ئابلووقە بدات و بە تەواوی بیخنکێنێت، لەلایەکی تر بە پاڵپشتی حکومەتی هەرێمەوە پەلاماری قەندیل بدات، هەوڵدان بۆ پاککردنەوەی دەنگە نارازیەکانی ناویەکێتی، بەشێکە لەو گەمە ستراتیژیەی ئێستا لەناوچەکە بەڕێوە دەچێت، کە دەبێت کورد زۆر وردبینانە تر سەیری ئەو رووداوانە بکات و لێیان تێبگات، لەبەرئەوەی سەرلەبەری ئەو گۆرانکاریانەی لەناوچەکە روودەدات، گۆڕانکاری پیلان ئامێزن و هەموو ئەو گۆرانکاریانەی لەسەر ئاستی هەرێمی وجیهانیدا روودەدات هەرگیز لەبەرژەوەندی کورد دا نیە، بۆیە دەبێت کورد تا بۆی دەکرێت هەوڵی مانەوەی خۆی بدات.

## سووتانی تورکیا وسیاسەتی زەوی سووتاندن

2021\8\2

سیاسەتی زەوی سووتاندن سیاسەتێکی کۆنە، بۆئەوەی دوژمن نەتوانێت سوود لە زەوی وبەرووبوومەکانی زەوی وەربگرێت، لەشەڕەکاندا بەکارهاتووە، زۆر جاران لە سوپاکان دوای شکستیان یاخود دوای کشانەوەیان، زەویەکانی دوای خۆیان ئاگر تێبەردەدا، عوسمانیەکان یەکێک بوون لەو نەتەوانەی بەشێوەیەکی بەرفراوان ئەو سیاسەتەیان پیادەکرد، تەنانەت لەکێشە ناوخۆییەکانیش ئەو سیاسەتە پەیڕە وکراوە، میرو بەگە کوردەکان لەکاتی دروێنەدا ئاگریان لەبەروبوومی یەکتر بەردەدا، لەم چەند ساڵەی دوایی تورکیا و رێکخراوی داعش ئەو سیاسەتەیان زیندوو کردەوە، لە کاتی دروێنەدا رۆژانە هەواڵی ئەوەمان گوێ لێدەبێت، کە داعش ئاگری لە زەویە کسشتوکاڵیەکانی ناوچە سنووریەکانی باشووری کوردستان بەرداوە، یاخود ئیسلامیە توندڕەوەکانی سوریا دارزەیتوونەکانی عەفرینیان بڕیوەتەوە وئاگریان لەکێڵگەکانی گەنم وجۆی کورد بەرداوە، هاوکات رۆژانەش میدیاکان هەواڵی بڕینەوەی دارستەکان وسووتماک کردنی خاکی کوردستان لەلایەن سوپای تورکیاوە بڵاو دەکەنەوە.

ئەو ئاگرەی لەتورکیا کەوتۆتەوە، لە هەموو ئەو ئاگرە راگەیەنراوانە فراوانترە، کە تائێستا کەوتۆتەوە، دەکرێت ئەو ئاگرەی

توركیا بەشێک بێت لە ڕووداوێکی سروشتی، هەروەها دەکرێت لەلایەن حکومەتی توركیا خۆی ئەو ئاگرە کرابێتەوە، بۆئەوەی وەک ئامڕازێکی سیاسی دژی نەیارەکانی بەکاری بێنێت، بەڵام پێشبینی ئەوەیان نەکردبێت، کە بەو شێوەیە پەرە دەسەنێت وبلاودەبێتەوە، بۆ نمونە ئێستا میدیاکانی توركیا بەشێوەیەک لەشێوەکان، بەبێئەوەی بەڵگەی پیویست بڵاوبکەنەوە دەیانەوێت پارتی کرێکارانی کوردستان تۆمەتبار بکەن، کە ئەمەش گریمانەی یەکەممان زیاتر دەسەپینێت وریگا بۆئەوە خۆش دەکات پاساو بۆ ئەو کارانە بێنێتەوە، کە لەئایندەدا پێی هەڵدەستێت، واتە بەشێوەیەک لەشێوەکان سەرەتایەکە بۆ قووڵبوونەوەی قەیرانەکان ومەترسیدارتر بوونی شەڕەکان لە ناوچەکە! هەروەک چۆن دەکرێت بەشێک بێت لەو شەڕە گەورەیەی لەناوچەکە دەگوزەرێت و ریگایەک بێت بۆ هاوسەنگ کردنەوەی چەک، پەیامێکیش بێت بۆ توركیا بۆئەوەی قەبارەی راستەقینەی خۆی بزانێت ووازلەو لەخۆبایی بوونەی بێنێت. لەبەرئەوەی وەک دەزانین توركیا لەلایەن ناتۆ و رۆژئاوا وتەنانەت روسیاشەوە چەکی زۆر مەترسیداری خراوەتە بەردەست وبەئارەزووی خۆی بەکاریدەهێنێت، بەبێئەوەی رەچاوی هیچ پێوەرێکی یاسایی ومرۆڤایەتی بکات، تا ئەو رادەیەی گریمانەی ئەوە دەکرێت زلهێزەکان ئەو ناوچەیەیان کردبێتە کێڵگەیەک ولەریگای توركیاوە چەکە نوێیەکانیان تاقیبکەنەوە!.

هەرچۆنێک بێت، سووتماک کردنی خاک وسروشت یەکێکە لەتاوانە قێزەونەکانی مرۆڤ، دەستدرێژیکردنە بۆ سەرژیان مافی نەک بە تەنیا مرۆڤەکان بەڵکو هەموو بوونەوەرەکانی تر، بێڕیزکردنە بەرامبەر

ئەو سروشتەی جگە لەژیان پێویستیەکانی ژیان، هیچ شتێکی تری بۆ مرۆڤەکان پێ نیە.

## تێنەگەیشتن لە چەمکی مێژوو

## تێنگەیشتن لە چەمکی شۆڕش!!!

## (1)

2021\8\4

یەکێک لەکێشەکانی قووڵەکانی کورد، تینەگەیشتنە لە چەمکی مێژوو، تاوەکو ئێستا نەک بە تەنیا لای تاکی کورد بەگشتی، بەڵکو لەزانکۆکان وکایە ئەکادیمیەکانیشدا، تەنانەت لەو بەشانەی تایبەتن بەمێژووش، مێژوو وەک گێڕانەوەیەکی چیرۆکەکانی رابردوو سەیر دەکرێت ولە هەندێک حالەتی دەگمەندا، تاک وتەرا، لەروانگەی فەلسەفەی مێژووی کلاسیکیەوە، سەیری رووداوەکانی رابردوو دەکرێت وهەوڵدەدرێت جۆرە یاسایەک، یاخود شتێک لەشێوەی یاسای لێهەڵێنجن ولەدووبارە بوونەوەی رووداوەکاندا پراکتیزەی بکەن، واتە دەرس و عیبرەتی لیوەرگرن!

سەیرکردنی مێژوو وەک رووداوەکانی رابردوو، کارەساتیک وتێنەگەیشتنێکی قووڵە، تەنانەت تا ئاستی نەزانین نەزانانەیە، لەبەرئەوەی کورتکردنەوەی مێژوو لە رابردوودا واتە سڕینەوەی دوو چرکەی سەرەکی تری زەمەن، ئێستا ورابردووە، کە بەهەموو شێوەیەک لە رابردووەکە، واتە لەو کردارانەی لەسەربنەمای ئەرکە وەزیفەیکیەوە

سەیر دەکرێن،گرنگترە. لەبنەرەتداهیچ یەکەیەکی زەمەن ناتوانرێت دابەش بکرێت، دابەشکردنی یەکەی زەمەنی، بۆ هەر سێ بەشی رابردوو وئێستا وداهاتوو، تەنیا لەپیناو راگرتنی زەمەن وتوێژینەوەیە لە بەشیک لەو بەشانە، کە ئەمە جگە لەگریمانەیەکی تیووری زیاتر نیەو بۆ تێگەیشتنێکی وردتر لەمێژوو سوودی لیوەردەگیرێت، بەڵام لەبواری پراکتیکیدا، هەرگیز یەکەی زەمەن دابەش ناکرێت ولەیەکتر دانابڕدرێت، لەبەرئەوەی لە بۆتەی یەک یەکەدا تواوەتەوە، کە پێی دەڵێن زەمەن، کاتێک مێژوو تەنیا بەرابردوو دەخوێنریتەوە، دەبێتە بتێک وپیرۆز دەکرێت، ئەمە وا دەکات مرۆڤەکان لە رابردوو بژین، بوێری ئەوەیان نەبیت هەنگاو بۆ ناو چرکەی ئێستا هەڵێنن وتەنیا لە روانگەی رابردووشەوە بیر لە دوارۆژ بکەنەوە، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی نەک ئێستایەکە، بەڵکو دوارۆژیش بۆخۆی پەلکێشی بکات وبیکات بەبەشێک لە رابردوو!

بۆیە مرۆڤی کورد کاتێک بیر لە ئێستاو دوارۆژ دەکاتەوە، لە رابردوودا دەژیت ولەجیاتی هەنگاو بەرەو پێشەوە بنیت بۆ دوواوە دەگەڕیتەوە، واتە بۆ رابردوو دەگەڕێتەوە، سەیری میدیاکانی کوردستان بکەین، نەک نمونەیەک بەڵکو دەتوانین بڵێین یەک پارچە نمونەیەکە بۆ ئەو بابەتە، یەکێکیتیەکان لە خەونی زیندووبوونەوەی یەکێتی رابردوو دەژین ودەست بەچڵە زەیتوونێکەوە دەگرن، بۆئەوەی رابردووی ئەو حزبەی رابردوویان، وەک خۆیان دەڵێن یەکێتیەکەی جارانیان لەدەست نەچێت! پارتیەکان گرەو لەسەر کوڕو ئامۆزاو برازاکان دەکەن بۆ ئەوەی پۆتۆپیای بارزانی باوکیان بۆ نوێ بکاتەوە، لەکاتیکدا ئەوانە بێئاگان

لەوەی، ئەوانە بوونەتە بەشیک لە رابردوو وئەگەر لەگۆڕەکانیشیان دەربهێنرین و زیندووش بکرینەوە، دوای ماوەیەکی زۆر کەم، هەر خۆیان زۆر بەپەلە دەیانگەڕێینەوە ناو گۆڕەکانیان! چونکە، مۆرکی چرکەی رابردوویان گرتووە و هەردوو چرکەی ئێستاو داهاتوویان لەدەست داوە، ئەمەیە هیگل ناوی دەنێت مەکری مێژوو، مرۆڤ بیر لەپۆتۆپیاکانی رابردوو دەکاتەوە وکار لەسەر وەبەرهینانەوەیان دەکات، مێژوو ئەو نمونەیان بۆ زیندوو دەکاتەوە، نەک بۆئەوەی ئێستایان بۆ بگۆڕێت، بەڵکو بۆئەوەی لە یاددانی مرۆڤەکان بەیەکجاری بسڕێنەوە وەک بکەرێکی مێژوویش هیچ بەهایەکیان نەمێنێت، ئەو نمونە بۆ هەموو حزبەکانی کوردستان، کە قۆناغی ژیان وبەردەوامبوونیان لەدەست داوەو لەسەر کەلاکە بۆگەن بووەکانی رابردوو دەژین، لەبار وگونجاوە.

ئەگەر بمانەوێت لەمێژوو تیبگەین، دەبێت هێندە بەئێستا وئایندەی ببەستینەوە، ئەو هاوکێشە باوەی، کە لەبواری فەلسەفەدا تا ئێستا کاری پێدەکرێت و توێژە کۆڵەوارەکانی کورد دەستی پێوە دەگرن، دوینی+ئەمڕۆ دەکاتە سبەی، دەبێت بگۆڕدرێت بۆ دوێنی + سبەی دەکاتە ئەمڕۆ، واتە هەردوو چرکەی زەمەنی دوینی وسبەی بخرێتە خزمەتی ئێستا، دەبێت بگەڕێینەوە ناو ئێستا ووار لە دوێنی سبەی بێنین، لەبەرئەوەی ئێستا ژیانە راستەقینەکەیە ونەدوێنی ماوە ونەئایندەش هاتووە، تەنیا وەک یەکەیەکی وەزیفی دەتوانرێت سوودیان لیوەربگیرێت وخزمەتی ئێستایان پێبکرێت

## (2)

### خوێندنەوەیەکی تر بۆ چەمکی شۆڕش

2021\11\15

تێگەیشتن لەمێژوو ئێجگار گرنگە بۆ تێگەیشتن لەچەمکێکی فریودەرو قیزەونی وەک شۆڕش، لە راستیدا لەگەورەترین داهێنانەکانی مۆدێرنیتەو شۆڕشی پیشەسازی فریودانی چەمکی شۆڕش بووە، زۆربەی ئەوانەی لەمێژوودا بەشۆڕش ناسراون ولەکتێبی قوتابخانەکان دەخوێنرێن، بەپیرۆز سەیردەکرێن وبەشان باڵیان هەڵدەدرێت، بەداخەوە تاوانی گەورەو پر شەرمەزاری مرۆڤایەتین! لەپەنای هاندان وفریودانی خەڵک بەناوی شۆڕش وگۆڕانکاری، توێژێکی کەمی سەرمایەدار بەری رەنجی ملیۆنان مرۆڤیان هەڵلوشیوە، ئێمە هەموومان رۆژێک لەرۆژان بەشان وباڵی شۆڕشی فەرەنسیمان هەلداوە، وەک ئەوەی لەکتێبەکان نووسراوە خویندوومانەتەوە وتییگەیشتووین، بە بێئەوەی هەست بکەین لەرێگای ئەو کتێبانەوە ئاڕاستە وبەکۆیلە کراوین! ئێمە شۆڕشی وەک ئەو دەقانەی لەکتێبەکان خوێندوومانەتەوە لەو شۆڕشە تێگەیشتووین، کەچی لەبنەڕەتدا شۆڕشی فەرەنسی بەرامبەر بەو دروشمە ئەندێشەییانەی بەرزی کردەوە، سەدان هەزاری مرۆڤی لەناو بردوو تیرۆری کرد، تەنانەت قۆناغێک لەقۆناغەکانی ئەو شۆڕشە بەقۆناغی تیرۆر ناسراوە! یەکەم تیرۆریش بە کوشتن ولەناوبردنی  بنەماڵەی پاشای فەرەنسا دەستی پێکردو دواتر سەرکردەکانی ئەو بەناو شۆڕشە کەوتنە وێزەی یەکترو لەپێناو دەسەڵاتدا ملی یەکتریان دەپەڕاند، ناپیلۆن، کە بەرهەمی

شۆڕشی فەرەنسی بوو، لەرێگای ژنەکەیەوە (یوجین بوهارییە) گەیشتە لوتکەی دەسەڵات وبۆ بەگەڕ خستنی کارگەی چەکی سەرمایەدارەکان زۆرترین شەڕی کرد وزۆرترین مرۆڤی بەکوشتن دا، بە گەرمکردنی ئەو شەڕانەش خێزانێکی سەرمایەداری جولەکەی وەک (رۆچڵد) نزیکەی 100 ملوێن فرەنکی فەرەنسیان وەک قەرز خستە بەردەست، ئەو هەموو تاوانە بەرامبەر ئەو دروشمە ئەندێشەییان بەرزیان کردەوە، (برایەتی ، یەکسانی، دادپەروەری)، کە تا ئێستاش وەکو دروشم ماوەتەوە وتوانای جێبەجێکردنی نیە!

ئێمە هەمیشە بەشان وباڵی شۆڕشی ئۆکتۆبەرو لینین هەلدەدەین، تەنانەت هەندیک کەس وەک رێگانامەیەک سەیری دەکات وکوێرانە قسەی لەسەر دەکات، لەکاتیکدا خودی لینین جگە لەسیخوڕێکی ئەلمانی زیاتر نەبوو و بەشەمەندەفەری ئەلمانی گەڕایەوە روسیا، هەموو ئامانجەکەش ئەوەبوو، روسیای تەزاری لەجەنگی جیهانی بێتە دەرەوە وبەرەی هاوپەیمانان جێبهێڵێت، دواتر ئەو سوپایەی روسیا، کە لەخوارووی قەوقاز تا کەنداوی فارس جێگیر ببوو لەژێر سەرکردایەتی ژەنراڵ باراتۆڤ بوو، پەلاماری هیندستان بدات وبەم شێوەیە گەوهەری تاجی بەریتانیا تیبکشێنن! بەڵام بەهۆی ئەوەی باراتۆڤ پشتی بەناو شۆڕشگێرەکانی نەگرت ووەک لایەنگرێکی سەرسەختی تەزار مایەوە، ئەو سوپایە هەڵوەشایەوە وئەو ئامانجە نەهاتە دی!.

ستالین بۆئەوەی ولاتەکەی لەوڵاتیکی کشتوکاڵیەوە بگۆڕێتە وڵاتێکی پیشەسازی، نزیکەی 10 ملیۆن مرۆڤی کردە قوربانی، ئەو ژمارەیە زۆر نزیکە لەژمارەی ئەو قوربانیانەی، کە لە سەدەی هەژدەو

نۆزدەهەمدا لە ئەفریقاوە لەلایەن سەرمایەدارەکانەوە دەکرانە کۆیلەو دەخرانە بازاڕەکانی ئەمریکاو لەرێگا دەریاییەکاندا لەناوچوون، لەبنەرەتدا روسەکان کۆمۆنیزم و کۆمەڵێک دروشمی گەورەیان وەک هێزیکی نەرم(SOFT POWER) بەکارهێنا بۆئەوەی لەرووی جیۆپۆلەتیکیەوە ئیمپراتۆریای روسیا دابمەزرێنن وخوێن وجواناوی گەلانی هەموو دنیایان خستە خزمەتنی ئەو پرۆژەیەوە!.

ئەوەی لە مێژووی تورکیا وئێران روویدا، دووبارە بوونەوەی هەمان کاری سیخوڕیەتی وئامادەکردنی کۆیلەی بازاڕ بوو بۆ سەرمایەدارەکان، کەمال ئەتاتورک تورکیای نوێی دانەمرزاند، بەڵکو کاری ئەوەبوو کەلتووری ئیسلامی تورکیا لەناوبەرێت، لەبەرئەوەی عوسمانیەکان لە جەنگ دۆڕابوون، بەڵام مەترسی خەلیفە بەهۆی هێزی نەرمی ئیسلامەوە وەک هەڕەشەیەک مابووەوە وتێکنەشکابوو، بۆیە مستەفا کمال پاشایان هێنا بۆئەوەی ئەو کارەیان بۆ ئەنجام بدات وهەموو کەلتووری تورکی وگەلانی ناوچەکە لەرەگەوە هەڵکەنیێت، هەمان شت بۆ رەزاشاش راستە ولەژێر پاراستنی تۆپەکانی بەریتانیا توانی دەسەڵات بگرێتە دەست وهەرکاتێکیش کاریان پێی نەما لە جەنگی دووەمی جیهانیدا ترۆیان کرد، وەک چەرچلی سەرۆک وەزیرانی بەرتاینا راشکاوانە گوتی :" ئێمە خۆمان رەزاشامان هێناو خۆشمان لامانبرد)!. دیارە ئەو بنەمایە بۆ هەموو بەناو شۆڕشەکانی ئەو ناوچەیەش راستە، وەکو بەناو شۆڕشەکانی کورد، ئەوەی پێی دەگوترێت شۆڕشی ئەیلوول وشۆڕشی نوێ وگوڵان و ... هتد، جگە لە بازراگانیکردن بەمەسەلەی کوردو خوینی مرۆڤی کورد زیاتر نەبووە، باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە زیاتر لەنیو سەدە

گەنجی کوردیان لەپەنای ئازادی بەکوشتن دا، زۆرینەی قوربانیەکانیش بەدەستی بەناو شۆڕشگێرەکان خۆیان  بوو، واتە لەشەری خۆبەخۆیی بوو! دواتریش، کە لچکێکی دەسەلآتیان کەوتە دەست، کەوتنە سووتاندن ودزین وهەڕاجکردنی نەک بەتەنیا باشوور، بگرە هەموو کوردستان! بۆیە دەبێت بەوردی خویندنەوەی نر بۆچەمکی شۆڕش بکرێت، ئەو گۆڕانکاری وپێشکەوتنانەی لەبواری زانست تەکنەلۆژیا روویانداوە وژێرخانی کۆمەڵگایان گۆڕیوە، خراپ بەکارهێنراون لەرێڕەوی راستەقنیەی خۆیان لادراون، سەرمایەدارە چاوچنۆکەکان خستوویانەتە بەرژەوەندی گیرفانی خۆیانەوە، بۆیە دەبیت بەجیا لەو کایە ترسناکە بکۆڵرێتەوە، ئەمەیە وایکردووە سەرباری ئەو پێشکەوتنە گەورانەی روویانداوە، هیچ کاتێک مرۆڤ بوون وەکو ئێستا لەبەردەم مەترسیدا نەبووە ومرۆڤایەتی لەبەردەم هەڕەشەی لەناوچووندا نەبووە!

## ڕەهەندی میدیایی لە جەنگی سێیەم دا

## کورد وئاگرەکەی تورکیا

2021\8\8

شەڕی نوێ بەپلەی یەکەم شەڕێکی ڕانەگەیەنراوە، هەموو کایەکانی ژیان دەگرێتەوە، ئەو شەڕانە زۆر بەخێرایی سەرهەڵدەدەن وبەشێوەیەکی ستوونی گەشە دەکەن، هەمیشە مەترسی ئەوەیان لێدەکرێت لە چرکەیەک لە چرکەکان بەخێرایی بڵاوببنەوە وجەنگێکی جیهانی گەورە دایسێنن. شەڕی نوێ بە پلەی یەکەم شەڕێکی میدیاییە، میدیا ڕۆڵێکی زۆر گرنگ دەگێڕێت لە ئامادەکردنی گۆڕەپانی شەڕ، لەبەرئەوەی لەسەردەمی شۆڕشی گەیاندندا باشترین ئامڕازە بۆئەوەی بەرەوەی ناوەوەی دوژمن بکرێتە گۆڕەپانی سەرەکی شەڕو لەناخەوە کۆمەلگاکان هەلتەکێنێت. ئەگەر لەماوەی ڕابردوو، واتە لەقۆناغی شەڕی یەکەمی سارددا سیخوڕەکان ڕۆڵی تیکدانی بەرەی ناوەخۆیان بینیبێت، لەسەردەمی نویدا میدیاکان ئەو ڕۆڵە دەگێڕن، کە تێچوونی زۆر کەمترەو مەترسیش لەسەر ژیانی جەنگاوەرەکان زۆر کەمترە، تەنانەت زۆرجاران جەنگاوەر لەناو خودی دوژمندا دروست دەکرێت ولەپەنای وڵاتپارێزی وئازادیەوە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەخرێنە کار، لەشەڕی ساردی نوێدا میدیا ئەو سەربازە، یاخود ئەو سیخوڕە نەبینراوەیە لەرێگای تیشکەکانەوە دەچێتە ماڵی هەمووتاکێک وچۆنی بوێت وا ئاڕاستەی

دەکات، ئەمە کارەساتێکی زۆر گەورەیە ولە ئێستادا گەورەترین هەڕەشەی بۆ سەر کۆمەڵگای کوردی دروست کردووە!.

میدیا لە کوردستان نەک بۆتە هۆی بەرەو پێشوەبردنی ئازادیەکان، بەڵکو ئازادیەکانیشی لە بەها راستەقینەکانی خاڵی کردۆتەوە، بۆتە ئامرازێک شەڕی کەلتوور وزمان وهەموو بەها رەسەنەکانی کۆمەڵگای کوردی پێدەکرێت، تەنانەت زۆر جاران لە دوژمنە هەرە سەرسەختەکانی کورد زیاتر خزمەت بە دوژمن دەکات وئازاری گەورەتر بەکورد دەگەیەنێت. ئێستا دوژمنانی کورد گەیشتوونەتە قۆناغێک پێویستیان بەوە نەماوە، یاخود زۆر کەمبۆتەوە، سیخوڕ ئامادە بکەن وبینێرنە هەرێمی کوردستان، بەڵکو بەشێکی هەرە زۆری میدیاکان وتەنانەت تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانیش ئەو ئەرکە زۆر بەجوانی رادەپەڕێنن، بەناوی شانازی نەتەوەییەوە، دوژمن پەلکێش دەکەن وتۆمەتی ناڕەوا بۆ میللەتەکەی خۆیان دەهۆننەوە، نەک بە تەنیا ژن وپیاو گەنجەکانیش، بەڵکو منداڵانیش دەکەنە کەرەستەیەک بۆ ئەو شەڕە وهەندێک تۆمەتیان دەخەنە پاڵ، کە هەرگیز لەگەڵ روحی پاکی منداڵاندا ناگونجێت. جێگای داخە، کە زۆرینەی میدیاکان وبەناو رۆژنامەنووسانی کوردستان نەک هەر لەئاستی بەرپرسیاریەتی نیشتمانیدا نین، بەڵکو بوونەتە بارێکی گران ومەترسیەکی گەورەش بەسەر نیشتمانەوە

دەبێت گەنج ورۆشنبیران ومیدیاکارانی کورد تێبگەن، دوژمنە سەرسەختەکانی کورد لە هەندێک دۆخدا دەیانەوێت کێشەکان وشکستەکانی خۆیان لەرێگای کوردەوە هەناردەی دەرەوە بکەن، بەمەش لەلایەک رێگا بۆ هەنگاوێکی تر بۆ داگیرکردنی کوردستان خۆش دەکەن،

لەلایەکی خۆیان لە تووڕەیی خەڵکی خۆیان دەدزنەوە ورای گشتی وڵاتەکانیان بەلاڕێدا دەبەن. بۆ نمونە وڵاتێکی وەکو تورکیا، کە بەهۆی ئەو ئاگرەوە، کەوتۆتە لێواری داڕمان وئابووری ئەو ولاتە خەریکە دەپووکێتەوە، سەرباری ئەوەی دووەمین گەورەترین سوپای ناتۆی بە هەزاران چەکدار وتۆپ وجبەخانەی هەیە، نەیتوانیوە ئامڕازی پێویست بۆ رووبەڕووبوونەوەی قەیرانێکی لەو شێوەیەی ئێستا دابین بکات وگەلەکەی لەبەردەم چارەنووسێکی نادیاردا هێشتۆتەوە، بۆیە بەدوای دوژمنێکدا دەگەڕێت تۆمەتەکەی بخاتە پاڵ، دیارە باشترین وئاسانترین وئامادەترین دوژمنیش کوردە، بۆیە بەهەموو شێوەیەک هەوڵدەدات کورد تۆمەتبار بکات، میدیاکانی تورکیا، بەتایبەتیش میدیای هێزە فاشیست وتوندرەوەکان، بەگەرمی بۆ ئەو تۆمەتبارکردنە کەوتوونەتە کار، کەچی میدیای کوردی لەجیاتی ئەوەی بەرەنگاری ئەو هەوڵە ترسناکە بێتەوە، بەشێکیان بەشانازیەوە ئەو پڕوپاگەندانەی تورکیا بڵاودەکەنەوە ووەک خەباتێکی نیشتمانی نیشانی خەلکی کوردستانی دەدەن، لەکاتیکدا ئەوکارە لێدانە لە ئاسایشتی نیشتمانی هەرێم وخەڵکەکەی دووچاری شەڕێکی نابەرانبەر دەکاتەوە، کە هەرگیز پیویستی پێی نیە!

## سەرۆکەکان ئازاترین وپیرۆزترین کەس نین!!!
## سەرۆکی ئەفغانستان وەک نمونە

15\8\2021

ئەوەی لە ئەفغانستان دەگوزەرێت، رۆمانەکەی سارتەر (هەڵدێر) مان بیر دێنێتەوە، کە چۆن رۆژئاواییەکان دانوستان لەگەڵ سەرۆکی پێشووی وڵاتێک دەکەن بۆئەوەی دەسەڵات جێبێڵێت، لە هەمان کاتیشدا گفتوگۆ لەگەڵ سەرۆکێکی نوێ دەکەن بۆئەوەی دەسەڵات بگرێتە دەست! لە هەردوو حالەتدا، دەسەڵات وەرگرتن ودەسەڵات جێهشتنەکە، جگە لەیاریەکی شەترەنج لەسەر تەختەیەکی فراوانی جوگرافیا زیاتر نیە!، جگە لە پڕۆسەی هێنان وبردنێک زیاتر نیە، لەنێوان ئەو هێنان وبردنەشدا، بەهەزاران خەڵکی وڵاتپارێزو نیشتمان پەروەر دەکرێتە قوربانی، ئەوانەی دێن ودەڕۆن، ئازاترین ودڵسۆزترین وزیرەکترین وئاوەزمەندترین کەسانی وڵاتەکەیان نین، وەک خۆیان نمایش دەکەن، بەڵکو ترسنۆکترین ونەزانترین وقێزەونترین بوونەوەری وڵاتەکەیانن، ئەوانە ئەو مرۆڤە چرووکانەن، کە بازرگانی بەوڵاتەکەیان دەکەن وهەرکاتێک داوایان لێبکرێت، دەهێنرێنە سەر دەسەڵات وئەوەی تاوانە بەرامبەر هاوڵاتیانی خۆیان دەیکەن، هەموو پیرۆزیەکانی ولاتەکەیان چرووک دەکەن وهەموو بەهاکانی دەخەنە ژێرپێ، بۆ رازیکردنی ئاغاکانیان سڵ لەهیچ ناکەنەوە، کاتێکیش رۆڵیان تەواو دەبێت ترسنۆکانە، بەشێکی زۆر لەزێڕ وزیوەکانیان هەڵدەگرن ومیللەتەکەیان گورگان خواردی دەکەن، ئەوەی ئێستا لە ئەفغانستان روودەدات. نمونەیەکی زیندووی ئەو شیکردنەوەیە، سەرۆکی ئەفغانستان نەک قارەمان وشۆڕشگێڕو وڵات پارێز نەبوو، بگرە ترسنۆکترین وبوودەڵەترین مرۆڤ بوو، لە تاریکترین چرکەساتدا،

دەستحەقی وڵات فرۆشیەکەی خۆی وەرگرت وخەڵکەکەی بۆ ئازار ونەهامەتی بەجێهێشت

# كۆتا يۆبیلەكانی پارتی... بەكورتی...!!

2021\8\16

بەبۆنەی تێپەڕینی 75 ساڵ بەسەر دامەزراندنی پارتی دیموكراتی كوردستان، ئەو پارتەی 75 ساڵە زیان بەمەسەلەی كورد دەگەیەنێت ولەشكستێكەوە بەرەو شكستێكی تری دەبات، دەیان وتار لەلایەن پارتیەكان وئەوانە رەخنە لەپارتی دەگرن نووسراوە، زۆربەی وتارەكانیش لەچوارچێوەی بەهێزبوونی ئەو حیزبە دەخولێتەوە، هەندێک لەو وتارانە جۆرێک لەدووڕوویی وهەلپەرستی وخۆڕەپێشكردنی پێوەیە، بەشێكی تر لە پەنای رۆشنبیری وسیاسەتزانی رەخنەگریەوە، كوێرانە بەناو كەوتوون خۆشیان سەر لەخۆیان دەرناكەن، یاخود نازە رەخنەیەک لەپارتی دەگرن ولەئامانجدا لەگەڵ بەرەی یەكەمدا یەكدەگرنەوە.

بۆئەوەی بەهێزی یا بێهێزی  ئەو حیزبە هەڵسەنگێنین، سەرەتا دەبێت لەخودی هێزەوە دەست پێبكەین، بزانین هێز چیە، ناكرێت ئێمە لەسەردەمی جیهانگەرایی هەمان خوێندنەوە بۆ جۆر وبنەماكانی هێز بكەین، ئەگەر وا لێكبدەینەوە، كە هێز چەند ملیار دۆلارێكە ولەدەستی بنەماڵەیەک كۆبۆتەوە، ئەوە ئێمە بەر لەهەموو كەسێک خۆمان فریو دەدەین. چونكە بەهێزی بە تەنیا لە ئابووریەكی دەست بەسەر كراودا نیە، بەڵكو لەچۆنیەتی مامەڵەكردن وبەیەكەوە بەستنەوەی ئەو ئابووریەیە بە كایە سیاسی ورۆشنبیری و كۆمەلایەتی .... كایەكانی تری ناو كۆمەڵگا،

ئەگینا بەپێچەوانە کاریگەری ئابووری ڕێک پێچەوانە دەبێتەوە، وەک ئەوەی لەهەرێم هەیە بینایەکان بەرزدەکاتەوە، مرۆڤەکان تێکشدەکێنێت، شەقامەکان دروست دەکات، دیمۆگرافیای دانیشتوان دەگۆڕێت ونیشتمان هەڕاج دەکات!

توێژەری ئەمریکی(جۆزیف نای) سێ جۆرهێزی دەست نیشان کردووە، هێزی ڕەق (Hard Power) کە سوپاو چەک وئامڕازە سەربازیەکان بەشێوەیەکی گشتی دەگرێتەوە، هێزی نەرم ( Soft Power)، کە بیروڕا وئایدیۆلۆژیا وکایە هزریەکان دەگرێتەوە، دوای جۆریش هێزی زیرەکە(Smart Power)، کە چۆنیە هەماهەنگیکردن لەنێوان هەردوو هێزەکەی تر، واتە تێکەڵکردنی هێزی نەرم وهێزی ڕەق وبەکارهێنانیان بەیەکەوە دەگرێتەوە. ئەگەر لە ڕوانگەی ئەو جۆرانەی هێز مامەڵە لەگەڵ هێزی پارتی دیموکراتی کوردستان بکەین، ئەوە لەرووی هێزی ڕەقەوە، هێزێکی سەربازی هەیەو دەیان هەزار پێشمەرگەی هەیە، کە ئەو هێزە دەبێت هیزێکی نیشتمانی بیت وبەرگری لە کوردستان بکات، کەچی کەوتۆتە دەستی بنەماڵەیەک وبەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی خۆی مامەلەی لەگەڵ دەکات ولەپێناو مانەوەی خۆیدا بەکاریدەهێنێت، چەندین ساڵە ئەگەرچی خۆی وەک گەورەترین وبەهیزترین حیزب نمایش دەکات وزۆرترین کورسی پەرلەمانی لەدەستدایە، نەیتوانیوە هیزێکی یەکگرتووی پێشمەرگەی نیشتمانی دروست بکات، ڕەنگ بیت سەنتەر بوون لەهێز فاکتریێکی ئەرێنی بیت، بەڵام لەچۆنیەتی بەکارهینانەکەیدا نەرێنی دەبێت، هەر کاتێک بەرژەوەندی خاوەنی ئەو هێزە لەگەل بەرژەوەندیە نەتەوەییەکاندا نەگونجێت، ئەوە

بەرژەوەندی حیزب، یاباشتر بڵێین بەرژەوەندی بنەماڵە دەخریتە پێشەوە، لەماوەی سی ساڵی رابردوودا بینیمان ئەو هێزە، هیندەی لەشەڕی ناوەخۆ وسەرکوتکردنی کورد دا بەکارهێنراوە، هێندە لە خزمەتی نیشتماندا نەبووە، لە هەموو شەڕە چارەنووس ئامێزەکاندا شکستی هیناوەو خەڵکی کوردستانی بۆ دوژمنان بەجێهێشتووە، رەنگ بێت هاتنی داعش وداگیرکردن وئەنفالکردنی شەنگال وگرتنی گوێر ومەخمور باشترین نمونە بێت بۆ ئاستی بەرەنگاربوونەوەی ئەو هێزە، دیارە هۆکاری سەرەکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی تا رادەیەکی زۆر ئەو هێزە لەدەستی خودی بنەماڵەی بارزانیش دەرچووە وگەندەڵی، وەک خۆیان ئاماژەی پێدەکەن، بەشێوەیەک ئەو هێزەی گرتۆتەوە، کە هەر رۆژەی پلانیک بۆ چاکسازی دادەنین وپێیان چارەسەر ناکریت، بۆیە ئەو هێزە بەو دۆخەی ئێستا ناتوانێت رووبەڕووی ئالنگاریەکان بێتەوە، بینیمان لە ئەفغانستان هێزی حکومەتی ئەفغان، کە زۆر سیمای لەهێزەکانی پارتی و کوردی بەگشتی دەچێت، چۆن نەیتوانی دەسەڵاتەکەی ئەشرەفی بپارێزێت وبەئاسانی تەسلیم بە چەکدارەکانی بزووتنەوەی تاڵێبان بوو!.

دەربارەی هێزی نەرم، ئەگەرچی ئەو حیزبە دروشمی دیموکراسی بەرز کردۆتەوە، بەلام رۆژ بەرۆژ لەدیموکراسی دوورتر دەکەوێتەوە، تەنانەت لەناو خودی حیزبەکەش، بۆ نمونە ئەگەر بەراوردێک بەمەکتەبی سیاسی ئیستای ئەو حیزبە بکەین، لەگەڵ مەکتەب سیاسیەکانی پێشووتریدا، دەبینین هیچ بواریکی بەراوردکردنی تیا نیە، لە شەستەکاندا مەکتەب سیاسی پارتی خودی سەرۆکی ئەو حیزبەی

(بارزانی باوک) ی سڕ کرد، تەنانە لەدوای راپەڕینیش، لەکاتی هێنانی هێزەکانی بەعس، (31ئاب)کارگێڕی مەکتەب سیاسی ئەو حزبە، کە ئەو کاتە سەرۆکی پەرلەمانیش بوو بەیاننامەی دژی ئەو هەنگاوەی حزبەکەی خۆی نووسی وناڕەزایەتی دەربڕی!.

بەڵام ئێستا ئاقڵترین مەکتەب سیاسیان دەڵێت، ئەگەر کۆنگرەش نەبەسترێت بۆ ئێمە گرنگ نیە، لەبەرئەوەی مەرکەزیەتێکی بەهێزمان هەیەو جەنابی سەرۆک دەتوانێت خۆی هەموو کێشەکان چارەسەر بکات! نەک هەر لەسەر ئاستی مەکتەبی سیاسی وسەرکردایەتی ئەو حیزبە، بەڵکو لەسەر ئاستی بنەماڵەی بارزانیش خەریکە ململانێکانی نێوان کور ونەوەکان دەتەقێتەوە وئاشکرا دەبێت، سەرباری ئەوەی بەهەموو شێوەیەک هەوڵی شاردنەوەی دەدەن! لەسەر ئاستی ئەندامان ولایەنگرانیدا ئەو حزبە لە خراپترین قۆناغەکانی خۆیدا دەژیت، ئەو کادیرانەی، کە خاوەنی بیروباوەڕێکی نیشتمان پەروەری بوون وپێیان وابوو دەتوانن لەچوارچێوەی ئەو حیزبە خزمەتی نیشتمانەکەیان بکەن، بەشیکی زۆر یا دانیشتوون یاخود لاتەریک کراون، بەرامبەر ئەمەش سوپایەکی هەلپەرست وبەرژەوەندیخواز جێگای ئەوانەی گرتۆتەوە، کە جگە لەگیرفانی خۆیان ئامادەنین خزمەتی هیچ شتێکی تر بکەن! مامۆستا وهاوکاری بەڕێزم دکتۆر محەمەد گەزنەیی یادی بەخێر بۆی باسکردم، کە بەبارزانی گوتبوو، ئێوە وەکو کەسێک دەکەن، کە پەرێز کۆدەکاتەوە راستەوخۆ پووشەکان دەخاتە سەرشانی، بەبێئەوەی سەیر بکات، دووپشک، یاخود ماری تیایە یا نا!؟ بەداخەوە گوێی لێنەگرتبوو، هەروەک چۆن ئێستاش گوێ لەکەس ناگرن!.

ئێستا پارتی لەکۆمەڵێک دووپشک ومار پێکهاتووە ولەنێو کۆمەڵێک دووپشک وماریشدا دەژیت، کە ئەوانە بەر لەخەڵکانی تر پێوەی دەدەن، ئێمە شایەدحاڵی راپەڕینین، کە چۆن ئەو جاش وبەعسیانەی، تا رۆژێک بەر لەراپەڕێن خۆیان وەک پیاوە دڵسۆزەکانی بەعس نیشان دەدا وخەڵکیان دەترساند، بۆ رۆژی دواتر وەک دەڵێن بەپێوە شەڕیان دەکردو بارەگاکانی خۆیان دەسووتاند، بۆیە هەڕەشەی راستەقینە لەسەر ئەو حیزبە لە ناوەخۆیدا نەک لە دەرەوەی، وەک شرۆڤەکاران وتەنانەت پارتیەکان خۆشیان خوێندنەوەی بۆ دەکەن، چونکە ئەوان لە هەموو کەسێک زیاتر هەست بەو نادادپەرووەری ولەخۆبایی بوونە دەکەن، کە هەموو جەستەی ئەو حیزبەی گرتۆتەوە. ئەمە جگە لەوەی لەرووی جەماوەریشەوە ئەمڕۆ پارتی لە خراپترین دۆخی خۆیدا دەژی، بەرهەڵستکارەکانی ئەو حیزبە وشیوازی کارکردنی ئەو حیزبە خۆی، گەورەترین سەرکەوتنیان لەناشیرینکردنی بەدەستهێناوە وتەنانەت وەک کادیرە پێشکەوتووەکانی خۆشیان هەندێک جار راشکاوانە ئاماژەی بۆ دەکەن، پارتی بوون بۆتە عەیبێکی گەورە لەکوردستان! جێگای داخە ئەو کاتە هەست بەو دۆخە دەکەن، کاتێک گلۆپێکی سەوز لە دەرەوە دادەگیرسێت ولەگەڵ خەڵکی تووڕەو راپەڕیو رووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، ئەو کاتە دەزانن رادەی تووڕەیی خەڵک لە چ ئاستێکدایە!

لەرووی باڵا دەستیشەوە، راستە هەندێک کەس دەیانەوێت ئەو حیزبە وەک بەهێزترین وسەرکەوتووترین حیزبی هەرێمی کوردستان نیشان بدەن، بەلام ئەوانە لەبیریان چووە، کە بەشیکی زۆری ئەو ناوچانەی لەژێر هەژموونی ئەودایە، ئێستا بەشێوەیەکی راستەوخۆ

کەوتۆتە ژێر دەستی تورکیا وتەنانەت قەڵا سەربازیەکانی تورکیا لەسەر لوتکە چیایەکانی خودی بارزانیش دانراون، ئەمە جگە لەوەی ئەوەی تۆزێک بەوردی سەیر ئیدارەدانی ئەو ناوچەیە بکات، بە ئاسانی جێپەنجەی تورکەکان دەبینێت، وەک لەنووسێنیکی تردا ئاماژەم پیکرد، ئەمە جگە لەوەی لە پەیوەندیەکانیان لەگەڵ حیزبەکانی تری کوردستان، لەسەر بنەمای ملکەچپێکردن یاخود دوژمنداری وەستاوە، کە ئەمە وا لەو حیزبانە دەکات، لەهەر تەنگەتاویەکدا بەتەنیای جێبهێڵن، هەرچەندە خۆیان بەهاوپەیمانیشی نیشان بدەن!. یاری کردن لەسەر هەستی نەتەوایەتی، زۆرینەی ئێراقیەکانی کردووەتە دوژمنی ئەو حیزبە، لەکاتێکدا موجامەلەیەکی خوێند ساردانەی شەقامی عەرەبی دەکات وئەو بەشەی هەرێمی بە یەکجاری تەعریب کردووە. لە پەیوەندیەکانی دەرەوەیدا، هەرچەندە وەک سەرکەوتوو خۆی نیشان دەدات، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت، پەیوەندیەکانی لەگەڵ وڵاتانی دەوروبەر پەیوەندیەکی نابەرابەرە و لەگەڵ وڵاتانی تریش گوێ بۆ ئامۆژگاریەکان رادەدێرن وچاویان لە یارمەتیەکانیانە!. بۆیە مانەوە ونەمانەوەی پارتی، بەهێز بوون وبێهیزبوونی، ئەو حیزبە بەهیچ شێوەیەک لەدەست خۆی نەماوە و بەگوێرەی تەمەنیش بێت لە یۆبیلەکانی کۆتایی تەمەنیدا دەژیت!

بەکورتی پارتی ئێستا حزبێکی بەبارمتە گیراوە وجگە لەهاوارکردن ولێدوانی گەورە هیچی تری بەدەستەوە نەماوە، ، وپێشم وایە هەرچەندەی زوو ئەو هاوارە بکات ودۆخە راستەقینەی خۆی بۆ خەڵک روون بکاتەوە، دەتوانێت خۆی رزگار بکات وئەگەر بۆ کەمێکیش بێت سۆزی لایەنگرانی خۆی بۆ خۆی رابکێشەوە!.

## بێدەنگی وملکەچ کردن، تاوانەکانی تورکیا ناوەستێنێت!

24\8\2021

ئەمڕۆ وەک وەزارەتی بەرگری تورکیا خۆی رایگەیاند، زیاتر لە بیست فڕۆکەی ئەو وڵاتە بۆردومانی کۆمەڵێک پێگەی پارتی کرێکارانی کوردستانیان کردووە لە هەرێمی کوردستان، لەنێو ئەو فڕۆکانە، فڕۆکەی بێ فڕۆکەوان وڤانتۆم 16 هەبووە، ئەو هێرشە یەکێکە لەگەورەترین هێرشە ئاسمانیە راگەیەنراوەکان، کە پڕ بەپێستی وشە، لەلایەک هەرێمی کوردستانی کردۆتە گۆڕەپانی شەڕێکی گەورە، لەلایەکی تر، بێباکانە هەموو رێساو یاسا نێودەوڵەتیەکان پێشێل دەکات! ئەوەی جێگای سەرسامیە، هەموو لایەنە ناوەخۆیی وهەرێمی وجیهانیەکان لەم سەرەڕۆیی تاوانکاریەی تورکیا بێدەنگن، لەسەر ئاستی ناوەخۆ حکومەتی هەرێم وەک ئەوەی نەبای دیبێت نەباران، قرقەپ لێی دانیشتووە ونووزەی لێوەنایەت، باوەڕناکەم لەدنیا جگە لەو حکومەتە، حکومەتێکی تر هەبێت بەو شێوەیە وڵاتەکەی سوتماک بکرێت وخەڵکی بێتاوانی بکرێتە ئامانج وا بێدەنگ بێت!.

ڕووداوەکان ئەوە دەسەلمینن تورکیا لەهەرێم جیاوازی لەنێوان پەکەکە وخەلکی مەدەنی کوردستان ناکات، گرنگ لای ئەو کورد بکوژرێت ومالّی کوردان وێران بکرێت، رۆژانە لەهەواڵەکان گوێمان لێدەبێت، چەندین خەڵکی بێتاوان بەهۆی تۆپباران وبۆردومانەکانی تورکیا کوژراون، حکومەتی هەرێم ومیدیای گاڵتەئامێزی ئازادو حیزبە بەناو گەورەو بەناوەڕۆک بچووکەکانی هەرێم کەس دەنگی لێوە نایەت، ئەوەی کارەساتەکە گەورەتر دەکات، لە بێدەنگیەکە پڕ شەرمەزارتر ئەوەیە زۆر جاران پاساویش بۆ تورکیا دێننەوە وپارتی کرێکارانی کوردستان تۆمەتبار دەکەن، وەک ئەوەی فڕۆکەکان هی ئەو حیزبە بێت کوردستان

بۆردومان بکات وتۆپهاوێژەکانی ئەو بن گوند ومندالٚ وپیرو ئاژەلٚ وداروبەردی ئەو نیشتمانە بۆردومان بکەن، نازانم سوودی بوونی حکومەتێک لەچیدایە بوێری ئەوەی نەبێت بەیەک وشەش ئەو تاوانکاریە سەرکۆنە بکات، کە بەرامبەر وڵاتەیکەی دەکرێت، نازانم سوودی ئەو هەموو کۆمپانیا بەناو حزبانە چین لەکوردستان، ئایا رۆڵیان پاساو بۆهێنانەوە بۆ تورکیا ودادۆشینی خەڵکی کوردستانە!؟ چ شەرمەزاریەکە بۆ میللەتێک حزبی لەو شێوەیە قبووڵ بکات ولەهەڵبژاردنەکان دەنگی بۆ بدات ودەنگی بۆ ساختە بکات! وایلێهاتووە میدیاکانیش بوێری ئەوەیان نیە تەنانەت هەواڵی ئەو تاوانانەش بڵاوبکەنەوە، کە تورکیا دەرهەق بەخەڵکی کوردستان دەیکات، تورکیا لەبەرزەقەی چاوی جیهان نەخۆشخانەیەکیان لەشەنگال بۆردومان کردو ژن ومنداڵی کوردانیان کوشت، ئەو میدیا وپێگە ئەلیکترۆنیانەی لەهەرێم ئەو هەواڵەیان گواستەوە لەپەنجەی دەست تێناپەڕن، تۆ بڵێی میدیاکانی کوردی لەپەنای ئازادی بیروڕاوە، تەنیا کاریان سووک کردن و تێکشکاندنی هەموو بەهاکانی کورد بێت، دەکرێت وڵاتێک بەو شێوەیە هێزی میدیایی کڕابێت وسوپایەیک لەجاشی قەڵەم بەدەست دروست کرابێت! ئەو هێرشەی ئەوڕۆ فڕۆکەکانی تورکیا کردیان وخۆیان گەیاندە سەر سنوورەکانی ئێران، نیشانەی گەلەکۆمەکیەکی زۆر ترسناک وریێککەوتنێکی هەرێمی وجیهانی زۆر مەترسیدارە، ئەگەر ئێران گڵۆپە سەوزی پێنەکردبێت فڕۆکەکانی تورکیا ناگەنە ئەو شوێنانە، ئەگەر ناتۆ وئەمریکا گڵۆپی سەوزیان بۆ تورکیا پێنەکردبێت، فڕۆکەکانی تورکیا تەنانەت بوێری ئەوە ناکەن، بەسەر ئاسمانی هەرێمیشدا بفڕن. بەراستی ئەوەی ئەو بێدەنگیەی لەهەرێم دەبینرێت سیاسەت کردن نیە، بەڵکو شەرمەزاریەکی سیاسی و حزبی وگەلی ونیشتمانیە، چاو گرتن وبێدەنگ بوون هەرێمی کوردستان ناپارێزێت، ئەوەی هەرێمی کوردستان دەپارێزێت شکاندنی ئەو بێدەنگیە ئابڕووبەرانە وپڕ شەرمەزاریەیە! ئەو هێرشەی ئەوڕۆ فڕۆکەکانی تورکیا

کردنیانە سەر هەرێم، سەرەتای قۆناغێکی پر مەترسیدارە، بێدەنگی وملکەچکردن، هەرگیز هەرێم رزگار ناکات، بەڵکو پەرتەوازەو ریسواتری دەکات.!

# ماکرۆن دەستی تورکیا لەناوچەکە دەبڕێتەوە؟

2021\8\30

لەکاتێکدا لوتکەی دەوڵەتانی هەرێمی لە ناوچەکە لەبەغدا بەسترا، سەرۆکی فەرەنسا، کەسەرۆکی دەوڵەتێکی ئەوروروپیە ودوورو نزیک بەشێک نیە لە هەرێمەکە، لەو لوتکەیەدا بەشداربوو! ئەو بەشداریکردنە سەرەتای قۆناغێکی نوێیە لەگۆڕانی هاوسەنگی هێز لەناوچەکە، هاوکات سەرنجڕاکێشترین خاڵ بوو لەکۆنگرەکە، هەموو ریسەکەی کردەوە خووری و بنەمای ئەو مەنزومەیە هەرێمیەی هەڵوەشاندەوە، کە لەدوای ساڵی (2007) بەشێوەیەکی ئاشکرا کاری لەسەر دەکرێت. لەبەرئەوەی بەگوێرەی ناونیشانی کۆنگرەکە بوایە، بەهیچ شێوەیەک فەرەنسا نەدەبوایە بەشداری ئەو کۆنگرەیە بکات، بەڵام بۆچی بەشداری کرد؟

بەر لەهەموو شتیک ئامانجی بنەڕەتی ئەو کۆنگرەیە خۆ ئامادەکردن بوو بۆ قۆناغی دوا کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا، واتە هەوڵێک بوو بۆ دارشتنەوەی ئەو مەنزومە هەرێمیەی، کە لەدوای رووخانی بلۆکی رۆژهەڵات گۆڕانکاری بەسەر داهات، بەڵام بەکەمێک هەموارکردنەوە دەستکاریەوە، بەتایبەتیش لەنەخشەی جوگرافی وڵاتەکان، وردتریش لەدیارکردنەوەی سنوورەکانی باکووری هەردوو وڵاتی سوریاو ئێراق، واتە دوو پارچەی کوردستان. تورکیا، کە ماوەیەکە بەپاڵپشتی ناتۆ، ناوچەیەکی فراوانی لەسوریا وئێراق کۆنترۆڵکردووە،

دەیویست لەو کۆنگرەیەدا شەرعیەت بداتە مانەوەی خۆی لەو ناوچەیەدا، پێی وابوو ئەمریکا دوای ئەوەی دەکشێتەوە، بەرپرسیاریەتی ئەو ناوچەیە دەخاتە ئەستۆی تورکیا، دووەمین گەورە وڵاتی ناتۆ، بەڵام بەشداریکردنی سەرۆکی فەرەنسا، ئەو خەونەی تورکیای لەگۆڕنا وبووە هۆکاری سەرەکی ئەوەی سەرۆکی تورکیا (رەجەب تەیب ئەردۆگان) راستەوخۆ بەشداری ئەو کۆنگرەیە نەکات، لەکاتێکدا کۆنگرەکە کۆنگرەیەکی لوتکە بوو دەبوایە سەرۆکی وڵاتەکان بەشداری بکەن! دوای ئەو چەند وڵاتێکی تریش، وەکو ئێران و سعودیە لەئاستی سەرۆکەکانەوە بەشداری ئەو کۆنگرەیان نەکرد!.

لەو کۆنگرەیەدا وەزیری دەرەوەی تورکیا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژەی بەئامانجەکانی تورکیا کرد، واتە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ داوای ویلایەتی مووسڵی کردەوەو لەوتارەکەیدا زۆر جەختی لەسەر لایەنی ئابووری بازرگانی و.... هتد شاری مووسڵ کردو لەپەنای شەڕی پارتی کرێکارانی کوردستان، کە ئەوان بەشەڕی تیرۆری دەناسێنن، هەوڵیدا شەرعیەت بەمانەوەی خۆی بدات، لەوناوچە سنووریانەی لە باکووری هەرێمی کوردستان داگیری کردووە، بەڵام وەک ئاماژەی پێکرا هاتنی سەرۆکی فەرەنسا هەموو پلانەکانی تورکیای هەڵوەشاندەوە وبەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هیوایەکی بەئێران بەخشی! لەبەرئەوەی رۆیشتنی ئەمریکا وهاتنی فەرەنسا بۆ ناوچەکە لەلایەک مەترسیەکانی سەر ئێران کەم دەکاتەوە، لەلایەکی تریش فەرەنسا هیچ چاوتێبڕینێکی لەخاکی ئێران نیە، بەڵکو مەبەستی سەرۆکی فەرنسا بەپلەی یەکەم ئێراق وبەپلەی دووەمیش سوریا بوو، لەبەرئەوەی

ویلایەتی مووسڵ بەگوێرەی پەیماننامەی سایکس پیکۆ بەر فەرەنسا کەوتبوو، لەو نەخشە سیاسیەی لە سایکس پیکۆ کەوتەوە، ویلایەتی مووسڵ بۆ فەرەنساو سوریاش بۆ بەریتانیەکان دیاریکرابوو، بەڵام دوای ئاگربەستی مۆدرۆس، واتە دوای وەستانی جەنگی یەکەمی جیهانی لەبەرەی رۆژهەڵات، ژەنڕاڵ مارشاڵ سەرکردایەتی ئەو هێزە بەریتانیەی کرد، کە بەبێ گوێدانە مۆدرۆس وپەیماننامەی سایسکس پیکۆ ویلایەتی مووسڵی داگیر کردو حالەتێکی دیفاکتۆی لەو ناوچەیە سەپاند، لەبەرئەوەی بەریتانیاش لەو قۆناغەدا گەورە زلهێزی جیهانی بوو، فەرەنسا نەیتوانی رووبەڕووی بێتەوە، بۆیە کاتێک سەرۆکی بەریتانیا لوید جۆرج، کلیمانسۆی سەرۆکی فەرەنسای  دەگەیاندە کونسوڵخانەی وڵاتەکەی لە لەندەن، کلیمانسۆ پرسیاری لە سەرۆکی بەریتانیا کرد، چی دەوێت بۆی بکات، ئەو یەکسەر وەڵامی دایەوە ویلایەتی مووسڵ بۆ ئێمەو سوریاش بۆ ئێوە، زۆر لەسەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە کلیمانسۆ بەهۆی ئەوەی زانیاریەکی زۆری دەربارەی ناوچەکە نەبوو، دەمودەست بەو داوایە رازی بوو، بەڵام ئەو خوێندنەوەیە خوێندنەوەیەکی دروست نیە، سەرۆکی فەرەنسا زانیاریەکی تەواوی دەربارەی ویلایەتی مووسڵ هەبوو، سیخوڕە فەڕەنسیەکان لە حەفتاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە زانیاریان لەسەر ئەو ناوچەیە کۆدەکردەوە، بۆیە هۆکاری سەرەکی ئەو رازی بوونە خیرایەی سەرۆکی فەرەنسا، ئەو حالەتە دیفاکتۆیە بوو، کە سوپای بەریتانیا سەپاندبووی و لەرووی هێزی سەربازیەوە فەرەنسا ئەو توانایەی نەبوو بیگۆڕێت!.

ئەو دۆخە نزیکەی 100 ساڵ، بەو شێوەیە مایەوە، سەرەتا بەریتانیەکان ودواتریش تەسلیمی ئەمریکیەکان کرد، بەڵام بەشێوەیەکی یاسایی و بەبنەما لەسەر سایکس پیکۆ ئەو ناوچەیە ناوچەیەکی هەژموونی فەرەنسیە، ئێستا، کە ئەمریکیەکان ئەو ناوچەیە چۆڵ دەکەن وبەشکستەکانیانەوە بەرەو سیاسەتی لاتەریکی دەگەڕێنەوە، وڵاتانی ناوچەکە بەتایبەتیش تورکیا، مرخی خۆی لەو ناوچەیە خۆشکردووەو سەرۆکەکانیان چەندین جار داوای گەڕانەوەی ویلایەتی مووسڵیان کردووەو بەبەشێک لە ئیمپراتۆریای عوسمانیە نوێیەکانیان هەژمار کردووە، لەدوای نەوەدەکانەوەش لەهەموو ئاڕاستەکانەوە کار لەسەر ئەو بابەتە دەکەن، کشانەوەی ئەمریکا ونزیکبوونەوەی یادی سەدساڵەی سایکس پیکۆ زۆر لەخەونەکانیانی نزیک کردنەوە ، بەڵام هاتنی ئیمانوێل ماکرۆنی سەرۆکی فەرەنسا، کە خۆی بەخاوەنی راستەقینەی ویلایەتی مووسڵ دەزانێت، هەموو ئەگەرەکانی هەڵوەشاندنەوە! سەردانی سەرۆکی فەرەنسا بۆ هەندێک ناوچەی دیاریکراوی ویلایەتی مووسڵ، پەیامێکی راشکاوانە وراستەوخۆ بوو بۆ تورکیا، سەردانی مووسڵ وهەولێر ودواتریش شەنگال، سەردانیکردنی ئەو ناوچانە بوو، کە تورکیا مرخی خۆی لێخۆش کردووە، بۆیە کاتێک تورکیا رێگای نەدا سەردانی شەنگال بکات، وەک پەرچەکردارێک، یاخود وەکو پلانی B گەڕایەوە هەولێر ولەگەڵ هەرسێ سەرۆکایەتیەکەی هەرێم وتەنانەت لەگەڵ سەرۆکی پارتیش کۆبوونەوەیی تایبەتی ئەنجامدا، کە ئەمەش لەئایندەدا رەنگ بێت کاریگەریەکی نەرێنیانە لەسەر پەیوەندیەکانی پارتی وتورکیا دەست پێبکات، لەلایەکی تر سەرەتای بڕینەوەی یاخود کورتکردنەوەی دەستی

تورکیا لە باشوور ورۆژئاوای کوردستان دەستیپێکرد!. بۆیە هاتنی ماکرۆن گەراندنەوەی رۆلی فەرەنسایە بۆ رۆژهەلاتی ناوەڕاست، لەکاتێکدا هەر لە لوبنانەوە بگرە تا دەگاتە سوریا وئێراق لەقەیرانی گەورەدا دەژیت، ئەو رۆژانەی دادێت، دەبێت چاوەروانی گۆڕانکاری گەورە بکەین لەناوچەکە، کە رەنگ بێت بەپێچەوانەی چەند هەفتەیەکی کەمی بەر لەئێستا لەبەرژەوەندی کورد بشکێتەوە.

## واز لەهەڵبژاردن بێنن!

2021\9\16

لەساڵی 1920، کاتێک پەیماننامەی سیڤەرئیمزا کرا، دەزگا هەواڵگری ومیدیاکانی رۆژئاوا بەهەموو شێوەیەک هەوڵیاندەدا کورد لەهەموو خەباتێک سارد بکەنەوە، هەرکاتێکیش لێرەو لەوێ هەوڵێک لە ئارادابوایە شکستیان پێدەهێنا، پڕوپاگەندەی ئەوەیان بڵاودەکردەوە، پێویستە کورد چاوەڕوان بکات کێشەکەی لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتیەوە، بەتایبەتیش کۆمەڵەی گەلانەوە چارەسەر بکرێت، بەم چەشنە توانیان بۆ ماوەی سێ ساڵ مەسەلەی کورد بەنج بکەن ودواتریش لەرێگای رێکەوتننامەی لۆزانەوە، گڵۆپی سەوزیان بۆ تورکە کەمالیستەکان دایساند، بۆ ئەوەی کورد قڕ بکات، لەدوای ئەو مێژووەوە تاوەکو ئێستا، واتە بەدرێژایی ماوەی نزیکەی سەد ساڵ لەهەموو پارچەکانی کوردستان جینۆسیاید ورەشەکوژی کورد بەردەوامە.

لەئێستادا خەریکە هەمان سیناریۆ دووبارە دەبێتەوە، لەکاتێکدا زۆرینەی کورد لەرۆژئاوا وباکوور وباشووری کوردستان کەوتۆتە بن نیری تورکەکان وبەئاگر وئاسن کوردستان سوتماک دەکات وگەنج ولاو وپیرە کورد تیرۆر دەکات، ئێران رۆژانە کوردستان بۆردومان دەکات وهێزەکانی لەسەر سنوورەکاندا کۆکردووەتەوە وئامادەیی تەواوی کردووە، بۆ ئەوەی ئەو هێڵە تەواو بکات، کە تورکیا لەسەر سنوورەکانی

رۆژئاوای کوردستانەوە دەستیپێکردووە، لەباشووری کوردستان خەڵکیان بە گەمەیەکی قێزەون، کە پێی دەگوترێت هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراق خەریک کردووە، ئەو ئێراقەی لەژێرەوە لەگەڵ تورکیا وئێران رێککەوتووە ودەرگای بۆ سووتاندن وکوشتنی کوردان بۆ خستوونەتە سەر پشت!

ئەو هەڵبژاردنە لەکاتێکدا بەڕێوە دەچێت، کە هێزە سەرەکیەکانی کورد لەداهێزران وتەسلیمبوونێکی تەواودا دەژین، دەبینین وەزعی یەکێتی چۆنە، لەململانێی حزبێکی سیاسی بۆتە ململانێی نێوان قاچاخچی ومافیاکان، پارتی لەکاتێکدا ماسوولکەکە پووکاوەکانی خۆی نیشانی خەڵکی کوردستان دەدا ودەیەوێت وەک قارەمانێک خۆی نیشانی گەلەکەی بدات، بوێری ئەوەی نیە وەکو دەڵێن بەرامبەر تورکەکان فزەی لێوە بێت، کە رۆژ بەرۆژ ناوچەکانی ژێردەستی ئەو زیاتر وزیاتر داگیر دەکات!.

هەڵبژاردن لەدۆخێکی ئاوادا چ بەهایەکی هەیە، کە مەبەست تەنیا خاوکردنەوە ودوورخستنەوەی نیگاکانی کوردە لەسەر مەسەلە بنەڕەتی ومافەرەواکانی! پێویستە رۆشنبیران وشۆرشگێڕانی کورد چیتر بەو سیناریۆیە قێزەوانە فریو نەخۆن ولەجیانی ئەوەی پێنووسەکانیان بەو گاڵتەجاریە خەریک بکەن، لەجیاتی ئەوەی قسە لەسەر پارتی ویەکێتی بکرێت، کە ئەوان هەموو ئامانجەکانی خۆیان بەدەستهێناوەو بوونەتە خاوەنی دەیان ملیاردۆلار وچاوەڕێی نەمانی ئەو هەرێمە دەکەن، بۆئەوەی، ئەوەی لەماوەی سی ساڵی رابردوودا دزیویانە بە ئارامی لەو کۆشک وتەلارانە خەرجی بکەن، کە لەخۆشترین وڵاتەکانی جیهان

کرێویانە، پێویستە لەدەرەوەی ئەوانەوە بیر لە چارەسەریەک بکرێتەوە!
با واز لەو گەمە قێزەونەی هەڵبژاردن بێنین وبەدوای رێگا چارەیەکی ستراتیژیدا بگەڕێین، با هەمان هەڵەی قۆناغی دوای سیڤەر دووبارە نەکەینەوە.

## لەبری شەرمەزاری ورِیسوایی....!

2021\9\17

رژێمە دیکتاتۆرەکان توانیان ژن ومنداڵی کورد زیندە بەچاڵ بکەن، توانیان شار وگوندەکانی کوردستان کیمیاباران وئەنفال بکەن، بەڵام هەرگیز وەک ئەو حیزب ودەسەڵاتدارانەی ئەمرِۆی کورد نەیانتوانی تاکی کورد بەوشێوەیە ریسوا بکەن، بەرهەمی سی ساڵی رابردوویان، هەرێمی کوردستانیان کردە هەرێمی سیخورِ وتریاک خۆر ودز وجەردە وپیاو کوژەکان، میتی تورک وئیتیلاعاتی ئێران لەهەرێم تەراتێن دەکەن، هەر رۆژەی شۆرِشگێرِێکی کورد لەبەر زەقەی چاوان وبەرۆژی رووناک تیرۆر دەکەن، هەواڵەکان پرِن لە بۆردومانکردنی درۆنەکانی تورکیا بۆ ئۆتۆمۆبیلەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان وشەهیدکردن ولەناوبردنی دەیان گەنجی ولاتپارێز، کە تاکە تاوانیان ئەوەیە خەون بە ئازادی میللەتەکەیانەوە دەبینن، چ شەرمەزاریەکە گەنجی کورد وا پەروەردە بکرێت، کە لەپێناو برِێک پارە، کە دڵنیام لەویش شەریکە بەشی هەیە، سیخورِی بۆ دەزگا هەرێمیەکان بکات وبراکانی خۆی تیرۆر وخەڵتانی خوێن بکات، ئایا ئەمە تەنیا تیرۆر کردنە یاخود پرِۆسەیەکی بازرگانیەو لەپەنایەوە چەندین بەرپرسی نابەرپرس گیرفانیان گەرم دەبێت!.

راستە مێژووی کورد پرِیەتی لە جاشایەتی وخۆفرۆشی، بەڵام ئەو جاشایەتی وخۆفرۆشیە هەرگیز خەڵکی دڵسۆزی کوردستان

نەیکردووە، ئەو کەسانە کردوویانە، کە دەسەڵاتدار بووینە ولەپێناو مانەوە وخۆشگوزەرانی خۆیان هەموو وڵاتیان تەسلیمی داگیر کەران کردووە، ئەوان بووینە گەنجی کوردی دڵسۆزیان ناچار کردووە، کە پەنا بۆ هەموو شتێک بەرێت، تەنیا بۆئەوەی لەدەستی ئەوان رزگاریان بێت، زۆربەی ئەوانەی وەک جاش دەناسرێن ورۆژێک لەرۆژان راوی پێشمەرگەیان دەکرد، گەنجی دڵسۆز ووڵاتپارێز بووینە ولەرقی ئەوانە چەکی جاشایەتیان هەڵگرتووە، هەر بۆیە دوای راپەڕین ئاشت بوونەوەو ویەکتریان لەهەمێز کردەوە! لەمەودوا دەبێت مێژوونووسانی کورد مێژووی کورد وسەرکردە جاش وخۆفرۆشەکان لەیەکتر جیابکەنەوە وبەجیا لەسەری بنووسن، لەبەرئەوەی سیخوڕ ونیشتمان فرۆشەکان وڵاتیان نیە، ئەوان بەشێک نین لەمێژووی ئەو نەتەوەیە، هەرکاتێک ئەوانە لەمێژووی نەتەوەکەمان تووڕهەڵدران، بەشێکی زۆری کێشەکانی کورد چارەسەر دەبێت!

خەڵکی دڵسۆزی کوردستان لەوەتەی هەیە قوربانی دەدات وسەرکردە بەناو سەرکردەکانی دەیفرۆشن ودەیخەنە دەستی دوژمنەکانی، ئەگەر وانەبێت بۆچی تا ئێستا سەرکردەیەکی باشوور، نەخۆی نەکەسێکی نزیکی نەکوژراوە ونە لەگوڵ کاڵتری پێگوتراوە! بۆچی قاسم لۆ، شەرەفکەندی، تیرۆکران، بۆچی وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان و هەموو دنیا بەدوای ئۆجەلانەوە بوو، تاوەک لەکونجی زیندانیان ئاخنی، ئەی بۆچی پێشوازی لەبەناو سەرکردەکانی باشوور دەکرێت، بۆچی ئەوان تا تەمەنی .... دەژین وتەنانەت لەناو کونە

شاخەکانیشدا، لەکاتیکدا پێشمەرگەکان بە سکێک تێر ودەیان سک برسی دەژیان، ئەوان ژیانێکی شاهانەیان دەبردە سەر!

کام سەرکردەی باشوور هەبووە، نەک خۆی بەڵکو کەسێکی نزیکیشی لەشەڕێکی رووبەڕووبوونەوەی دوژمندا گیانی بەخت کردبێت؟ بۆچی هەزاران خانەوادەی کورد لەباشوور وێران بوو، منداڵی هەژاری کورد لەشارەکان، لەچیاکان، لەگوند وپێدەشتەکاندا، بەناوی کوردایەتیەوە راوەدوونران وتیرۆر کران، کەچی ماڵی سەرکردەکان تادێت بەرزتر وئاوەدانتر دەبیتەوە! ئەوە چی دەگەیەنێت فڕۆکەکانی تورکیا، تۆپەکانی ئێران، ولاتەکەت بۆردومان دەکەن ونەک مرۆڤەکان بەڵکو دارەکانیشت دەبڕنەوە دەیسوتێنن، تۆش بەرگریان لێبکەیت، پێشوازیان بکەیت ودەست لەناو دەست بەروویان پێبکەنی! دەمەوێت بنووسم ئای ئەمە چ شەرمەزاریەکە، چ ریسواییەکە، بەڵام نەشەرمەزاری ونەریسوایی ئەو دۆخە پێناسە ناکات، بۆیە دەبێت لەبری ئەو وشانە بەدوای وشەی تردا بگەڕێین، شەرمەزاری بۆ رەفتاری کەسانێک شیاو نیە، کە هەموو تەمەنیان بۆ فرۆشتن وبێبەهاکردنی گەل وولاتەکەیان تەرخانکردووە!.

## سەیرترین بەیەکەوە ژیان لەهەرێمی کوردستان!

2021\9\24

رەنگ بێت تا ئێستا هێندەی لەسەر بەیەکەوە ژیان خوێندوومەتەوە وگوێم لێبووە، سەیرترین خوێندنەوە تیگەیستن بۆ بەیەکەوە ژیان ئەو تێگەیشتنەی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە بۆ بابەتە! کورد دەڵێت شت یان لەشێت یا لەمنداڵ، بەهۆی بانگەشەی هەڵبژاردنەوە زۆر جاران منداڵە سیاسیەکانی حیزبەکان لێرە ولەویَ ئازایانە، یاخود ساویلکانە هەندێک راستی دەدرکێنن، کە بایەخی مێژوویی خۆی هەیە وتەنانەت لەرووی یاسایشەوە دەتوانرێت بکرێتە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگر ووەک دانپانانێک هەژمار بکرێت بۆ سەلماندنی تاوانێک لە تاوانەکان، چونکە داڵدانی تاوانباران، بەتایبەتیش داڵدەدانی ئەو تاوانبارانەی، کە بە تاوانی جینۆسایدکردنی گەلان تۆمەتبار کراون، کە بەتاوانی دژی مرۆڤایەتیش دەناسرێت، خوی لەخۆیدا تاوانێکی گەورەیە وبەهیچ شێوەیەک لەشێوەکان ناکەوێتە چوارچێوەی لێبووردەیی وبەیەکەوە ژیانەوە! بۆیە ئەو کەسانەی، یاخود ئەو هێزانە داڵدەی ئەو جۆرە تاوانبارانە دەدەن، دەبێت لە دوو لاوە دادگایی بکرێن، لەلایەک بەهۆی پڕۆسەی خودی داڵدەدانەکەوە، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا بۆ بابەتێکی هەستیارترمان رادەکێشێت، ئەویش بابەتی هاوبەشیکردنە لەو تاوانە، چونکە تەنیا ئەو هێزو کەسانە تاوانباری لەو شێوەیە داڵدەدەن،

که بەشێوەیەک لەشێوەکان لینکێکیان لە تاوانەکەدا هەیە وئەگەری هەیە بەشێوەیەک لەشێوەکان بەڵگەنامەکان ئەوانیش بگرێتەوە!.

ئەوەی لەهەرێمی کوردستاندا لەسەر ئاستی سیاسی بە بەیەکەوە ژیان پێناسە دەکرێت، دوور ونزیک پەیوەندی بە بەیەکەوەژیانێکی ئاشتیانەوە نیە، بەڵکو لەلایەک پەیوەندی بە بەشداریکردن لەتاوان ودیزەبەدەرخۆنەکردنی بەڵگەی تاوانەکانەوە هەیە، لەلایەکی تر جۆرێکە لەهەڕاجکردنی خاکی کوردستان وبازرگانیەکی قێزەونە بە خاکی نیشتمان، ئەوانەی هاتوونەتە کوردستان بەشێکی زۆریان ئەو سەرمایەدارانەن، کە لەسەردەمی بەعسدا بەشێوەیەکی ناشەرعی سەرمایەیان پەیداکردووە وئێستا بەو پارەیە وخانوو وشوێنە بازرگانیە گرنگەکان وئەپارتمانە گەورەکان شارەکانی هەریم دەکڕن، کە لەلایەن بەرپرسە بازرگانەکانی کوردەوە، کە بەشێکی زۆریان لەپشت ئەو پڕۆژانەوەن دەفرۆشرێت، واتە ئەوەی پێی دەگوترێت بەیەکەوە ژیان لەهەرێمی کوردستان، جۆرە رێککەوتنێکە لەنێوان سەرمایەدارە وردبین وسیاسیەکانی عەرەب، کەوەکو سەرمایەدارەکانی جولەکە، کە حکومەتی ئیسرائیلیان لەپشتە رەفتار دەکەن، لەگەڵ سەرمایەدارێکی نەخوێندەواری کورد، کە جگە لە هەرزانفرۆشکردنی وڵاتەکەی چاوی هیچی تر نابینێت، بۆیە واخەریکە لەرێگای ئەو بەیەکەوە ژیانە سەیرەوە، وردە وردە دیمۆگرافیای کوردستان دەگۆڕێت وئەوەی دەوڵەتە داگیرکەرەکان بەدەیان ساڵ بۆیان نەکرا، ئەو بازرگانە چاوچنۆکانەی کورد بەماوەیەکی زۆر کەم وبەبێئەوەی کەسیش پێیان بڵێت لەپشت چاوتان دوو برۆ هەیە، بەئاسانی ئەنجامی دەدەن، لێرەدا من مەبەستم چینە هەژارەکەی خوارەوە

نیە، کە لەبنەڕەتدا لەخەمی قووتی ڕۆژانەی خۆیاندان وئەوانە هەمیشە بەئاشتی بەیەکەوە ژیاون کێشەی بەیەکەوە ژیانی ئاشتیانەیان نەبووە!.

ئەو بەیەکەوە ژیانەی پارتی شانازی پێوە دەکات، سەیرترین بەیەکەوە ژیانە لەمێژوودا، ئەگەر نەڵێم وێنەی نەبووە، ئەوا بەدڵنیاییەوە نمونەی ئێجگار کەمە، سەیر لەوەدایە لەکاتێکدا ئەوان تۆوی رق وتووڕەیی لەناو کۆمەڵگای کوردیدا دەچێنن، مامۆستایەک، کە داوای مووچەی رەوای خۆی دەکات ساڵێک زیاتر بە بێ دادگایی کردن لەزیندان دەئاخنن وهەناسەی ئازادی لێ قەدەغە دەکەن، داڵدەی ئەو تاوانبارانە دەدەن، کە هەزاران ژن ومنداڵ وگەنجی کوردیان لەناو بردووە و جۆرەها چەکی قەدەغەکراوی نێودەوڵەتیان دژی بەکارهێناوە، جیاوازیان لەنێوان پیرو ژن ومنداڵ وگەنج وئاژەڵ وداروباخەکانی کوردستان نەکردوە و لەلایەن دادگاکانەوە داوا کراون ، نازانم ئەوە دەکەوێتە کوێی بەیەکەوە ژیانەوە، ئەگەر وەک عەرەب دەڵێن ئینەک لە بابەتەکە نەبێت!

## بونیاتنانی هێزی سێیەم یاخود هێزی یەکەم!

2021\9\26

زیاتر لە چل ساڵە لەباشووری کوردستان گفتوگۆ لەسەر دروستکردنی هێزی سێیەم دەکرێت، بۆئەوەی بالادەستی یەکێتی وپارتی لاواز بکرێت! ئەو گفتوگۆیە لەبنەڕەتدا گفتوگۆیەکە لەسەر هیچ وناتێگەیشتن لەدۆخەکە بونیاتنراوە، لەبەرئەوەی هەرێمی کوردستان پیویستی بەدامەزراندنی هێزی سێیەم نیە، بەڵکو پێویستی بەدامەرزاندنی هێزی یەکەم هەیە، تاوەکو ئەو بنەما هزری وهاوسەنگیە رامالێت، کە بەناو حیزبەکانی باشوور لەماوەی رابردوودا پیادەیان کردووە، واتە کوردستان پێویستی بەهزرێکی نوێ و خوینیکی نوێ هەیە، کە ئەو قۆناغە پڕ شەرمەزاریە تێپەڕێنێت، کە لەماوەی رابردودا بەناوی کوردایەتی شۆڕشەوە ئەنجامدراوە.

بیرۆکەی هێزی سێیەم لە سیاسەتی نیودەوڵەتیدا بەپلەی یەکەم لەپیناو تێکشکاندنی هاوسەنگی هێز وکەمکردنەوە، یاخود کۆتکردنی هیزی لایەنەک لەلایەنەکان پیادە دەکرێت، بۆنمونە لەکۆتایی سەدەی نۆزدە وسەرەتای سەدەی بیستەم قاجاری وعوسمانیەکان لە تورکیا وئێران لە ئەڵمانەکان نزیک بوونەوە بۆئەوەی لەرۆڵی بەریتانیا وروسیا کەمبکەنەوە، لەسیاسەتی ناوەخۆشدا زۆرجار هەوڵدەدرێت هیزێکی نوێ دروست بکرێت، بۆئەوەی لەدەسەڵاتی هیزێکی تر کەم بکرێتەوە

وهاوسەنگیەکی میانڕەو بهێنرێتە دی، کە بەرژەوەندی هەموو هێزە بالادەستەکان بپارێزێت، بەڵام ئەو هاوسەنگیانە لەکاتیکدا پێویستە وسەرکەوتوو دەبێت، کاتێک ئەو هێزانە لەبنەڕەتدا لە خزمەتی خەڵکدا دابن وبۆ ئەو مەبەستە دروست کرابن، کە بەداخەوە ئەو دۆخە لەهەرێمی کوردستاندا بوونی نیە! ئەو هێزانەی لەهەرێمی کوردستاندا کاردەکەن، هێزی دروستکراون وبەگوێرەی پلانێکی نێودەوڵەتی ولەپیناو بەرژەوەندی ئەو هێزانە ودژی بەرژەوەندیە سەرەکیەکانی خەڵکی کوردستان بەکاردەهێنرێن، لەلایەکی تر لەئێستادا لەهەریمی کوردستان دوو هێز لە ئارانیە، بەڵکو تەنیا یەک هێزەو دوو رۆڵ دەبینێت، پارتی ویەکێتی، کەلە بنەرەتدا دوو بنەماڵەیی سیاسین، لەسەر بەرژەوەندیە سەرەکیەکانی خۆیان بەرادەیەک رێککەوتوون، کە هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆیان لەنێواندا نەماوە، بۆیە هەژمارکردنی ئەو دوو بنەماڵەیە وەک دوو هێزو لەسەر ئەو بنەمایە کار بۆ دروستکردنی هێزی سێیەم بکرێت، لەبنەڕەتدا هەنگاوێکە ولەسەر هیچ بونیات دەنرێت، ئەوەی لەسەر هیچیش بونیات بنرێت هیچە! بۆیە دۆخی هەرێم پێویستی بەدامەزراندنی هێزی سێیەم نیە، بەڵکو پێویستی بەدامەزراندنی هیزێکی نوێیە، بەرلەهەموو شتێک هزرێک و دنیابینیەکی نوێی بۆ مەسەلەی کورد وپەیوەندی نێوان هێز وگەلانی ناوچەکە هەبێت، هەر کاتیک ئەو هێزە دروست بێت، ئەوە دەبێتە هێزی یەکەم وکۆی دیمەنی سیاسی لەهەرێمی کوردستان وبگرە لەهەموو کوردستانی گەورە تێکدەشکێنێت!.

## ئەوەی دەیڵێن وئەوەی دەیبینین!!!

## زۆر بەکورتی.....

2021\10\5

ئەوەی گوێ بە پڕۆپاگەندەکانی هەلبژاردنی ئەم جارە رادێرێت، شتی سەیرو سەمەرەی بەرگوێ دەکەوێت، کە هیچ لەرەفتاری ئەو حزبانە ناچێت، زیاتر لەسی ساڵە ئەو وڵاتە ویران دەکەن! ئەوان هەموو هەوڵ وبۆچوونەکانی خەڵک بەموزایەدە هەژمار دەکەن، کەچی یەک شتیان نەگوتووە، هێندەی من گوێم لێبووە موزایەدە وقسەی بێ بنەما نەبێت، هەموو حزبەکان، بەتایبەتیش پارتی ویەکیتی بە سەروەری یاساو داگاکان و قەزایان گرتووە، کەچی ئەوەی سەیری هەولێر وسلێمانی بکات، لەهەموو رووێکەوە ئەوەی حیسابی بۆ نەکرێت یاسایە، ئەگەر سەروەری یاسا هەبێت، بۆ نمونە چۆن دەبێت کەسانێک تەنیا لەسەر ئەوەی داوای مووچەی خۆیان کردووە، بۆ زیاتر لەساڵێک لەزیندان بئاخنرێن ودادگایش نەکرێن! ئەوەی سەیری ئیدارەکانی هەولێر وسلێمانی بکات، بۆی دەردەکەوێت یاسا چەند ریسواکراوە ولەسەربنەمای خێڵەکی وحزبایەتی وپیاوپیاوانێ حوکم دەکرێت وپۆستەکان دەبەخشرێنەوە!.

نازانم لەو دوو زۆنە چی بەیاسا کراوە؟ هەڵبژاردنەکان، دیموکراسی، خوێندن، دامەرزاندن، کارکردن، کۆمپانیا دانان، چی بەیاسا کراوە؟ وەک دەڵێن یاسا تەونی جاڵجاڵۆکەیەو بەهێزەکان دەیپسێنن

وبێهێزەکانیش پیوەی دەبن، ئەوە ڕێک بۆ هەرێمی کوردستان لەبارە! چەندین کەس لەو دوو زۆنە دژوارەدا دەکوژرێن، بەبێئەوەی بکوژەکانی زۆربەی ئەو تاوانانەش دەستگیر بکرێن، حکومەت بەئارەزووی خۆی مووچە دەبڕێت وپاشەکەوتی دەکات ودەیگونجێنێت ونایدات، بەبێئەوەی پشت بەهیچ یاسایەک ببەستێت ویاسایەک هەبێت ئەو هەنگاوە قبووڵ بکات! لەهەموی سەیر تر باسی کەرکووک ومەسەلەی تەعریب دەکەن، لەکاتێکدا لەدامەرزاندنی ئێراقەوە تاوەکو ئێستا، بەرژێمی بەعسی شۆڤینیزمیشەوە، کە ئەنفال وجینۆسایدی کوردستانی کرد، هێندەی ئەو دوو حیزبە هەرێمی کورستانی تەعریب نەکردووە، ئێستا لەجیاتی ئەوەی قسە لەسەر تەعریب کردنی کەرکووک بکەن، واباشترە قسە لەسەر تەعریبکردنی هەولێر وسلێمانی و دهۆک وتەنانەت شەقلاوە وسۆران و چۆمان وجاحی ئۆمەران تەوێلەو بیارەو زاخۆ بکەن، چ بستە خاکێکی هەرێم ماوە لەپێناو گیرفانی خۆیاندا نەیانفرۆشتبێتە عەرەب وتورک وهەموو ئەو کەسانەی ئامادەبووینە دوو قڕووش بدەن! لەهەموو مێژووی مرۆڤایەتی کێ وەکو ئەو دوو بەناو حیزبە خاکی وڵاتەکەی هەراجکردووە ولەدەست دوژمنانی کردووە!

ئەوەی جێگای سەرسامیە، باس لە سەروەری وپاراستنی خاکی کوردستان دەکەن، کەچی زیاتر لە سی ساڵە دەستی تورکیا وئێران وئێراق دەگرن وچاوساغیان بۆ دەکەن، بۆئەوەی لەرقی یەکتر وڵاتەکەیان داگیر بکەن، چ هێزێک هەیە، وەک پارتی ویەکێتی بەرگری لەداگیرکەران بکات وبیانپاریزێت وچاوساغی وسیخوڕیان بۆ بکات!؟ ئەوە هێزەکانی یەکێتی نیە، بەنهێنی هەموو شتێک بۆ ئێران دەکات، ئەوە پارتی نیە،

پاسەوانی لەهێزەکانی تورکیا دەکات ودەستی بۆ هەموو شوێنێکی کوردستان رادەکێشێت، کێن ئەوانەی سیخوڕی بۆ ئەو دەوڵەتانە دەکەن وهەموو رۆژێک لەدەڤەری سەوز وزەردا گوێمان لێدەبێت، گەریلایەکی باکوور، پێشمەرگەیەکی دیموکرات تیرۆر دەکرێت! ئەوانەی سیخوڕی بۆ داگیرکەران دەکەن، کێن؟! کێن ئەوانەی سیخوڕی وولاتفرۆشیان کردە کەلتووری بەشێکی زۆری ئەو کۆمەڵگایە؟ ئەوە چ شەرمەزاریەکە، وەک ئەوەی خەلکی کوردستان کەڕ ولاڵ وکوێر بێت نەهیچ ببینێت ونەهیچ بژنەوێت!.

لایەکیان کوێخایەتی قبووڵ ناکات ولاکەی تر خۆی بەخزمەتکاری خەلک نیشان دەدات، کەچی هەردوو خۆیان کردووە بەکوێخای گەلەکەی خۆیان وکەوش هەڵگری داگیرکەرانی کوردستان! بەراستی ئەوەی لەو هەڵبژاردنە گوێم لێدەبێت، هەندێک جار وا دەکات پرسیاری ئەوەم لادروست بێت، کە دەبێت ئەوانە راست نەکەن وکوردستان شامی شەریف نەبێت؟ یاخود وەک گۆبلز دەڵێت درۆ بکە درۆبکە، تا خەڵک باوەڕت پیدەکەن، بەڵام قسەکەی گۆبلزیش هەر بۆماوەیەک دەخوات، ناکرێت تۆ سی ساڵ درۆ لەگەڵ خەڵک بکەیت وخەلکیش بەردەوام باوەرت پێبکات! بەراستی شیکردنەوەی کەسایەتی وسایکۆلۆژی ئەو کەسانە نەک بەفرۆید، بەڵکو بەباوکی فرۆیدیش شیناکرێتەوە! ئەوانە تووشی جۆرە نەخۆشیەک بووینە، کە دەبێت هەوڵبدرێت ناویکی نوێی بۆ بدۆزرێتەوە!، چونکە لەو باوەرەدا نیم هیچ شتێک لەو وڵاتە مابێت ووێرانیان نەکردبێت ودەستیان بەسەر دانەگرتبێت!؟ زانکۆکان، دادگاکان، نەخۆشخانەکان، سیتیەکات، باڵەخانەکان، بیرە نەوتەکان، پالاوگە

نەوتەکات، زەویە کشتوکاڵیەکان، نەمامگە گەورەکانی شارەکانی کوردستان، چی ماوە بەناوی خۆیان وماڵ ومناڵ و خزمی خەزووری سەپانی شێخی بابیان نەکردبێت! کەسێک بەو شێوەیە رەفتار بکات وبەم زمانەش قسە بکات، دەبێت خۆی گەمژە بێت یاخود خەلکی کوردستانی لا گەمژە بێت؟ بەراستی ئازایەتی وبوێری دەوێت، لەدۆخێکی وەک ئەمڕۆی کوردستان بوێری ئەوەت هەبێت بەم زمانە قسە بکەیت، کە دڵنیام خۆیان بەرلەهەموو کەسێک بەخۆیان باوەڕناکەن، لەهەمووش سەیرتر بە متمانە بەخۆبوونێکەوە یەک بەدەنگیان هاوار دەکەن ودەیانەوێت یاری بەهەست وسۆزی خەڵک بکەین، بەڵام کێشەی سەرەکی ئەوانە لەوەدایە، دیوەکەی تری هاوکێشەکە نابینن، کە خەڵکی کوردستان پڕ بەدڵ ولەناخەوە پێیان پێدەکەنێت، بۆیە پێم وابێت ئەوانە جگە لەخۆیان، سەرباری ئەوەی ملیۆنان دۆلاری خەڵکی کوردستان لەمیدیاکانیان سەرف دەکەن، کەسی تر، تەنیا بۆ پێکەنین وکات بەسەر بردن نەبێت، گوێیان لێناگرێت!!

## هەڵبژاردن لەنێوان سووتاندنی دەنگ وبایکۆت کردندا...

2021\10\6

یەکێک لەبنەما سەرەتایی وسەرەکیەکانی هەر هەڵبژاردنێک بوونی متمانەیە بەو هێزو لایەنانەی رکابەری دەکەن وئەو دامودەزگایانەی هەڵبژاردنەکە بەڕێوە دەبەن، ئەگەر ئەو متمانەیە لەئارادا نەبێت هەڵبژاردن لەپڕۆسەیەکی دیموکراسی وبەکارهینانی مافیکی مەدەنی، دەبێتە گاڵتەجاری وفریودانی خەڵک، لەبەرئەوەی نەک ئەو گۆڕانکاریانە ناهێنێتە دی، کە خەلک دەیانەوێت لەرێگای دەنگدانەوە بەدەستی بێنن، بەڵکو دۆخە چەقبەستووەکە درێژ دەکاتەوە ودەرفەتێکی تر بۆ گەندەڵکاران وئەو هێز وکەسانە دەرەخسێنێت، کە بەدەستی ئەم وئەو کاردەکەن ولەپیناو بەرژەوەندیە کەسیەکانی خۆیان دەجەنگن!

راستە دوای راپەڕین لە هەرێمی کوردستان ودوای رووخانی رژێمی بەعسیش لەئێراق خەلک بەخۆشحالی وگەرم وگوڕیەوە بەرەو سندووقەکانی دەنگدان هەنگاوی نا، بەلام بەهۆی ئەو دۆخە سیاسی وکۆمەڵایەتی ورۆشنبیریەی لەناوەخۆی ئەو ولاتە وژینگەسیاسیە هەرێمیەکەیدا هەبوو، تا ئێستا هیچ هەڵبژاردنێکی پاک لەو وڵاتەدا نەکراوە، لەزۆربەی هەڵبژاردنەکاندا دەنگی ناڕازی بەرزربۆتەوە وهێزەکان یەکتریان بەساختەکردن وگۆڕینی دەنگەکان تۆمەتبار کردووە، بەڵام لەکۆتایدا بەرژەوەندیەکانی خۆیان رێکخستووە ولەسەر دابەش کردنی کورسیەکانی پەرلەمان رێککەوتوون! بەمەش ئەو هەلبژاردن ودەنگدانەی خەلکیان لە کرۆکەوە پووچەڵ کردۆتەوە وهیچ بەهایەکیان بۆ نەهێشتۆتەوە، سەدان ملیۆن دۆلاریان لە موڵکی گشتی بەهەدەرداوە وهەڵبژاردنەکە جگە لە پڕۆسەیەکی قێزەونی فریودانی خەلک وشانۆگەریەکی پووچگەرایی زیاتری لێبەرهەم نەهاتووە.

ئەم بێمتمانەییە بۆتە هۆی ئەوەی ، هەڵبژاردن لەدوای هەلبژاردن ڕێژەی بەشداریکردنی خەڵک کەمتر بێتەوە ولەجیاتی ئەوە بیر لەوە بکریتەوە، کە ئایا چۆن دەنگ بدەن ودەنگ بەچ لایەنێک بدەن بۆئەوەی گۆڕانکاری لە دۆخی وڵات ئەنجام بدەن، لەبەر بێهیوابوون لەهەموو لایەنەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی ئێراق بەگشتی، خەڵک بیر لەوە دەکاتەوە بچێت بۆ دەنگدان ودەنگەکەی خۆی بسووتێنێت، تاوەکو دەنگەکەی ساختە نەکرێت وکەسێکی تر سوودی لیوەرنەگرێت، یاخود لەبنەڕەتدا بایکۆتی هەڵبژاردنەکە بکات ونەچێتە دەنگدانەوە؟!

ئێستا لەهەریمی کوردستان گفتوگۆیەکی چڕ لەسەر ئەو دوو بیرۆکەیە هەیە، لایەن وهێزە سیاسیەکان بەگەرمی هانی خەلک دەدەن بۆئەوەی بەشداری هەڵبژاردنەکان بکەن وئەگەر لەگەڵ هیچ لایەکیشدا نەبوون، دەنگەکانی خۆیان بسووتینن! بەڵام ئاڕاستەیەکی تر داوای بایکۆتکردن دەکات. دیارە بایکۆت کردن ودەنگ سووتاندن دوو پڕۆسەی سیاسی جیاوازن وهەریەکەی واتا وکاریگەری خۆی هەیە. وەک ئاماژەی پێکرا، لایەنەکان داوای بەشداریکردن دەکەن، خۆیان وەک خەمخۆر ورۆشنبیر ودڵسۆز نیشان دەدەن بە لێبوردەییەوە داوا پەیام بۆ خەڵک دەنێرن، بەشداری هەڵبژاردنەکان بکەن، دەست بەرداری ئەو مافەی خۆیان نەبن ودەنگ بەکاندیدەکانی ئەوان بدەن، ئەگەر هەر نا دەنگەکانیان بسوتێنن، دیارە ئەمەش شێوازێکە لەفریودانی خەڵک، لەبەرئەوەی تەنیا چوون بۆ دەنگدان، واتای شەرعیەتدانە بە پڕۆسەیەک، کە لەبنەڕەتدا جێگای متمانە نیە، ئەوان دەیانەوێت زۆرترین خەلک بەشداری بکات، لەکۆتایشدا، بەهۆی کەموکوڕیەکان وڕیگا زۆرەکانی ساختەکردن لە هەڵبژاردنی ئەلیکترۆنیدا، بەئاسانی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنەکە بگۆڕن!. کەواتە دەتواتنین بڵێین دەنگ سووتاندن، بەشداریکردن و شەعیەتدانە بە پڕۆسەیەکی سیاسی، کەلە بنەڕەتدا لەسەر ساختە وساختەکاری بونیاتنراوە ونەک خەلکانی بێلایەن، بگرە حزب وهێزەکان خۆشیان

متمانەیان پێی نەماوە! هەرچی بایکۆتکردنە واتای ڕەتکردنەوەی کۆی پڕۆسەکەیە، بەشێوەیەک لەشێوەکان نارەزایەتی ومانگرتنێکی مەدەنیانەیە وشەرعیەت سەندنەوەیە لە پرۆسەیەک، کە باوەڕیان پێی نەبووە، ئەگەر ڕێژەی ئەوانەی ئەو مافە، واتە مافی بایکۆتکردن بەکاردەهێنن بەرێژەیەکی بەرچاو زۆر بێت، ئەوان هەڵبژاردنەکە لەرووی یاسایشەوە بەهای نامێنێت ودەبێت پەنا بۆ دووبارە کردنەوەی ببرێت، بەتایبەتیش ئەگەر لایەنێکی بەهێزو کاریگەری ئۆپۆزسیۆن هەبێت وداوای دووبارە هەڵبژاردنەوە بکات!. کەواتە دەکریت رۆژی دەنگدان، وەک پەۆچەکردارێک بۆ دۆخە ئاڵۆزەی هەیە ولەپیناو ئەوەی تاک بەهای خۆی بگەڕێنێتەوە وچیتر رێگا نەدات وەک بوونەوەرێکی بێئاوەز وناکامڵ مامەلەی لەگەلدا بکرێت، دەتوانێت رۆژی دەنگدات بکاتە رۆژێکی بایکۆتکردنی مێژوویی ومانگرتنێکی سەرتاسەری، بەمەش پەیامێکی راشکاوانە دەنێرێت وراستەقینەی ئەو دۆخە ڕووندەکاتەوە، کەوا کوردستان و ئێراقی پیادا رەتدەبێت!

لێرەدا پرسیارێک دێتە ئارا، ئایا رێژەی بەشداریکردنی خەڵک لەدەنگدان کاریگەری لەسەر ئەنجامەکانی دەنگدان دەبێت؟ بێگومان نەخێر، لەبەرئەوەی لە بنەڕەتدا هەڵبژاردن بۆ فریودانی خەڵک ونیشاندانی ئەو دیوەی کۆمەڵگایە، کە نیەتی! لەهەڵبژاردنی ساڵی (2018) بەگوێرەی هەندێک سەرچاوە رێژەی بەشداریکردن لەکۆی ئێراق گەیشتە 20–22% لەهەندێک شاردا لە 5–6% تێنەپەڕی، وەک شاری بەسرە بۆ نمونە، کە ئەمە بە هەموو پێوەرێک هیچ بەهایەک بۆ هەڵبژاردنەکە وەک بنەمایەکی دیموکراسی ناهێڵێت، چۆن دەکرێت ئەو رێژەی کەمەی کۆمەڵگا، کە بەسەر رەوت وحیزب وکەسایەتی جیاوازەوە دابەش بووە نوێنەرایەتی 80% کۆمەڵگا بکات، لەکاتێکدا زۆرینەی سادە لە هەڵبژاردندا (50+1)ە! لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانیش رێژەکە زۆر لەو رێژەیەی ئێراق باشتر نەبوو، وەک باس دەکرێت لەشارێکی وەکو هەولێر سەرەڕای ئەو

هەموو ساختە کاریەی کرا، 11% ی خەڵک بەشداری هەڵبژاردنیان کرد! لەو جۆرە هەڵبژاردنانەدا پێشینە زلهێزەکان وهێزە هەرێمیەکان لەگەڵ هێزە گەندەڵەکانی گۆڕەپانەکە پێکهاتوون، بۆ پاراستن وهێشتنەوەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان لەسەر حیسابی بەرژەوەندی ومافەکانی خەڵک دەیانپارێزن ودەیانهێڵنەوە، بۆیە بەشداریکردن لەو جۆرە هەڵبژاردنە جگە لەسووکایەتی کردن بەخود هیچی تر نیە! لەبەرئەوەی تەنیا بەچوونی خەڵک بۆ دەنگدان، بەبێئەوەی رەچاوی دەنگەکان بکرێت ولەسەر ئەو بنەمایە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان دیاری بکرێت، هەوڵدانێکە بۆئەوەی شەرعیەتێکی ساختە بدەنە ئەو هێزانەی، کە لەبنەڕەتدا داردەستی خۆیانن وئەجێنداکانی ئەوان جێبەجێدەکەن! هەرچۆنێک بێت بایکۆت کردن لەرووی دەروونیەوە بەهایەک بۆ تاکەکانی کۆمەلگاکانی دەهێڵێتەوە وهیچ بەهایەکیش ناداتە هەڵبژاردنەکە وپەیامێکە، کە ئەو جۆرە هەڵبژاردنە ناتوانێت هیچ لەدۆخە گەنیو وچەق بەستووەکە بگۆڕێت!.

## کاتێک هەڵبژاردن چرووک دەبێت!

### بایکۆت کردن لەهەولێر تا ئێستا ژمارەی پێوانەیی  تۆمار کردووە!

2021\10\10

هەرچەندە لەهەڵبژاردتی رابردوودا رێژەی بەشداربوون ئیجگار کەم بوو لەهەندێک شاردا لە 5-6% تێنەپەڕاند، بەڵام واپێدەچێت لە هەڵبژاردنی ئەمڕۆدا رێژەکە هێشتا کەمتر بووبێتەوە، لەئێستادا، کە نزیکەی نیوەی کاتی دەنگدان بەسەر چووە، بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی دەستم کەوت، لە هەولێر زۆربەی هۆڵەکانی دەنگدان چۆلن و کامیرەی تەلەفزیۆنە حیزبیەکان نایانەوێت ئەو دیمەنە راستەقینانە بگوازنەوە، بۆ ئەوەی ئەم زانیاریانەش پشت راست بکەمەوە، سەردانی چەند بنکەیەکی دەنگدانم کرد، زۆربەی چۆل بوون بەشێکیان چەند کەسێکی کەمیان لەبەردەم دابوو،  ئەگەر تائێوارە بەم شێوەیە بمێنێتەوە، هەڵبژاردن هیچ واتا وبەهایەکی نامێنێت! ئەم بایکۆتکردنەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی لەلایەک خەڵک متمانەی بەو هێزە سیاسیانە نەماوە، لەلایەکی تر گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی، کە بەهۆی ساختەکاریەوە، لەگۆڕانکاری لەرێگای سندووقەکانی دەنگدانەوە بێهیوا بووە، بۆیە دەبێت دوای ئەو هەڵبژاردنە چاوەڕوانی قۆناغێکی نوێ بکەین!.

## ڕێکەوتننامەی لۆزان ودەزگای هەواڵگری تورکیا

## (1)

2021\10\17

یەکێک لەکێشەکانی بەناو رۆشنبیر وسیاسەتمەدار میدیاکان ئەوەیە، زانیاریەکانیان دەستی دووە وتاقەتی ئەوەیان نیە بگەڕێنەوە سەر سەرچاوە بنەڕەتیەکان و زانیاریەکان وەک ئەوەی هەیە وەربگرن، بوونی چەندین تۆری کۆمەڵایەتی ومیدیایی ئەلیکترۆنیش بۆتە سەرچاوەیەکی لەبار بۆ بلاوکردنەوەی زانیاری ناڕاست وبەشیوەیەک بوارێکی گەورەی بۆ کاری هەواڵگری رەخساندووە، دەزگا هەواڵگرییەکانی ناوچەکە بەگشتی وهەواڵگری تورکیا بە تایبەتی سوودیان لەو لایەنە وەرگرتووە ولەخزمەتی سیاسەتی ولاتەکەیاندا بەکاریدەهێنن.

یەکێک لەو دمگۆ وبانگەشە ناڕاستانەی بلاودەکرێتەوە، کە میدیاکان، لەوانە میدیا عەرەبی و کوردیەکانیش نەزانانە کەوتوونەتە ژێر هەژموونی ئەو شەپۆلەی هەواڵگری تورکیا، مەسەلەی هاتنی ساڵی 2023 وبەکۆتا هاتنی رێکەوتننامەی لۆزانە، شایەنی ئاماژە بۆ کردنە هەواڵگری تورکیا لەو رێگەیەوە دەیەوێت، رێگا بۆ هێرشێکی گەورە خۆش بکات، یاخود لەرووی دەروونیەوە خەڵکی هەرێم بۆ داگیرکاریەکی لەم شێوەیە ئامادە بکات.

ئەوەی جێگای سەرسامیە نەک میدیاکان، بەڵکو زۆر لە بەناو سیاسەتمەدارە کورد وعەرەبەکانیش لە شیکردنەوەکانیاندا، وەک ئەوەی هەنگوینیان لەدار دۆزیبێتەوە وپێشبینیەکی سیاسیانە بکەن، ئەو دمگۆیانە دەجوونەوە ودوپاتی دەکەنەوە، بە بێئەوەی یەکێک ئەو ئەرکە بچووکەی خستبێتە سەر شانی خۆی وسەیرێکی رێکەوتننامەی لۆزانی کردبێت، کە وەرگێڕانە عەرەبیەکەی تەنیا 65 لاپەڕەیە ولەوانەیە بە چەند کاتژمێرێکی کەم بخوێنرێتەوە!

بۆئەوەی بەشێوەیەکی یاسای وەڵامی ئەو دمگۆ وشەڕە هەواڵگریە بدەینەوە، سەرەتا دەبێت بپرسین ئایا ساڵی (2023) رێکەوتننامەی لۆزان بەکۆتا دێت؟ دەربارەی مەسەلەی بەکۆتاهاتنی رێککەوتتنامە نێودەوڵەتیەکان، لەهەندێک رێکەوتننامە لەدیباجەی سەرەتایدا باس لە ماوەی بەکۆتاهاتنی ریکەوتننامەکە دەکرێت، یاخود لایەنەکانی رێککەوتنامەکە لەسەر ماوەیەک رێکدەوکەن بۆئەوەی رێکەوتننامەکە بەکۆتا بێت، یاخود ئەو ئەرکەی رێکەوتننامە لەپێناوی دەبەسترێت تەواو دەبێت، یا دوای ئەوە رێکەوتننامەیەکی تر دەبەسترێت وئەو رێکەوتننامەیە رەتدەکاتەوە، یاخود هەمواری دەکاتەوە، یاخود هەر دوو لایەن بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە رێکەوتننامەکە رەتدەکەنەوە، هەندێکجار رێکەوتننامەکە رەتدەکرێتەوە یاخود کاری پیناکرێت، لەبەرئەوەی توانای جێبەجێکردنی نیە، یاخود لایەنێک لە رێکەوتننامەکە دەکشێتەوە، بەڵام ئەگەر سەیری رێکەوتنامەی لۆزان بکەین، لەمادەی 143 دا باس لە کاتی کارپێکردنی رێککەوتننامەکە کراوە، بەڵام باس لە بەکۆتاهاتنی نەکراوە! بەڵام لەبەرئەوەی رێکەوتننامەی لۆزان هەموو ئەو

ئامانجەی هێنایە دی، کە بۆی دانرابوو، دەتوانین بڵێین ئەو ریکەوتننامەیە لەمێژە بەکۆتا هاتووە. هەرچەندە هیچ لایەنێک لە لایەنەکان تاوەکو ئێستا لە ریکەوتننامەکە نەکشاوەتەوە، تورکیا، کە بەهۆی ئەو بانگەشانەوە ئاماژە بۆ ئەو کشانەوەیە دەکات وباس لەوە دەکات، ساڵی (2023) ئەو رێکەوتننامەیە تەواو دەبێت، واتە تاکلایەنە دەکشێتەوە، ئەو بانگەشەیەی تورکیا پرسیارێک دەوروژێنێت، ئایا تورکیا ئەو توانایەی هەیە رووبەڕووی کۆمەڵگای نێودەولەتی ببێتەوە؟ بێگومان نەخێر! پاشان دەبێت ئەو راستیە بزانین، کەوا رێکەوتننامەی لۆزان رەنگدانەوەی قۆناغێکی دیاریکراو بوو لە هاوسەنگی هێزی جیهانی ووەک دۆڕاوێکی شەڕ بەسەر تورکیا سەپێنراوە، تاوەکو گۆڕانێکی گەورە لەهاوسەنگی هێزی جیهانیدا روونەدات، ناتوانێت هەنگاوێکی لەو شێوەیە بنێت، چونکە ئەو گۆڕانانەی ئێستا لە هاوسەنگی هێزو سیاسەتی نێودەوڵەتیدا دەگوزەرێت، هیچی لەبەرژەوەندی هاتنە دی ئەو خەونەی تورکیا نیە.

## (2)

2021\10\18

لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە، مەسەلەی ویلایەتی مووسڵ بەگوێرەی کۆنگرەی لۆزان، کە بەم شێوەیە دەهۆڵی بۆ دەکوتن، لەساڵی (1923) دا یەکلایی نەبۆتەوە! ئەگەر سەیری دەقی ئەو رێکەوتننامەیە بکەین، کە لەپێنج بەرگ (الجزء) پێکهاتووە و143 مادە لەخۆوە دەگرێت، لە بەرگی یەکەم بەشی یەکەم، لەو بەندانەی تایبەتە بەخاکەوە، لەمادەی سێیەمییدا باسی ئەو زەویانە دەکات، کە لەدەریای سپی ناوەڕاست

دەگرێتەوە تا دەگاتە سنوورەکانی ئێران، واتە سنوورەکانی هەردوو ولاتی سوریا وئێراق دەگرێتە خۆ، بەواتایەکی تر رۆژئاوا وباشووری کوردستان لەخۆوە دەگرێت، پەیوەست بە سنوورەکانی سوریا، دیاریکردنی ئەو سنوورە دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو سنوورەی، کە لەمادەی 8 رێکەوتنامەی فەرەنسی –تورکی لە20 ئۆکتۆبەری 1921 دەست نیشان کراوە، هەرچی دیاریکردنی سنووری ئێراقە، لەو مادەیەدا هاتووە:" سنوورەکانی نێوان تورکیاو ئێراق بەگوێرەی رێکارێکی دۆستانە لەنێوان تورکیاو بەریتانیا لە ماوەی 9 مانگدا دەکێشرێت، ئەگەر هاتوو هەردوو حکومەت لەو ماوەیەدا نەگەیشتنە رێککەوتن، ناکۆکیەکە رەوانەی کۆمەڵەی گەلان دەکرێت، هەردوو حکومەتی تورکی وبەریتانی بەڵێن دەدەن، تا ئەو کاتەی دەگەنە بڕیارێک بۆ یەکلایی کردنەوەی مەسەلەی سنوور، هیچ جوولەیەکی سەربازی، یاخود هیچ کردارێکی تر ئەنجام نەدەن، کە بەشێوەیەک لەشێوەکان ئەو دۆخەی ئێستا ، کە چارەنووسی کۆتایی دەوەستێتە سەر ئەو بڕیارە، بگۆڕێت"

دیارە تورکیا وبەریتانیا لە کۆنگرەی لۆزان نەگەیشتنە ئەنجام، دواتر دوولایەنە ولەدەرەوەی کۆنگرەکە هەوڵیان کێشەکە چارەسەر بکەن، بۆ ئەو مەبەستەش لەساڵی 1924، لەکۆنگرەی قوسەتنتینیە نەگەیشتنە ئەنجام ودواتر مەسەلەی ویلایەتی مووسڵ درایە کۆمەڵەی گەلان، لە کۆتاییەکانی 1925، ئەو مەسەلەیە، کە بە مەسەلەی دیاریکردنی سنووری تورکیا ئێراق دەناسرێت، یەکلایی کرایەوە ودواتر لەساڵی 1926 رێکەوتننامەی تورکی – ئێراقی – بەریتانی گرێدرا، کە

مەبەستی یەکەمی ئەو ریکەوتننامەیە لێدان وسەرکوتکردنی مەسەلەی کوردی بوو!.

بەم چەشنە بۆمان دەردەکەوێت مەسەلەی سنووری نێوان ئێراق و تورکیا، واتە لکاندنەوەی ویلایەتی موسڵ بەئێراق نزیکەی 3 ساڵ دوای کۆنگرەی لۆزان بوو. لەوەش سەیر تر، نەک ئەو هەڕەشەی تورکیا، بەڵکو هەر بەگوێرەی خودی مادەی 27 رێکەوتننامەی لۆزان، ئەو لەشکرکێشیەی تورکیا بۆ ناو خاکی هەریم لەئێستا کاریکی نایاساییە پێچەوانەی ئەو رێکەوتننامە نێودەوڵەتیەیە، لەبەرئەوەی وەک لەو مادەیەدا هاتووە:"نابێت حکومەت یاخود دەسەڵاتی تورکیا هیچ دەسەڵاتێکی قەزایی لەمەسەلە سیاسی وئیداری وتەشریعیەکان بە هەر هۆیەک بێت، بەسەر هاوڵاتی ئەو هەریمانە پیادە بکات، کە دەکەونە ژێر سەروەری یا پاسەوانی ئەو دەوڵەتانەی ئەو رێکەوتنامەیان ئیمزا کردووە، یاخود لەتورکیا جیابوونەتەوە ودەکەونە دەرەوەی سنوورەکانی تورکیا". جێگای سەرنجە تورکیا هەر بەمەشەوە نەوەستاوە، بەڵکو خودی ئەو مادانەشی پێشێل کردووە، کە پەیوەستە بە مافی کەمینەکان و م38- تاوەکو 44 بۆ تەرخانکراوە، بەتایبەتیش مادەی 38، کە دەڵێت:" حکومەتی تورکیا بەڵین دەدات، کە ژیانی سیاسی بۆ دانیشتوانی تورکیا بە تەواوی زامن بکات، بە بێئەوەی بەهۆی شوێنی لەدایک بوون یاخود رەگەزو یاخود زمان وئاین و ئەتنیک، جیاکاری بکات! بەگوێرەی ئەو مادەیە، هەموو دانیشتوانی تورکیا مافی ئەوەیان هەیە بەئازادی، هەر بیرو باوەڕێک یاخود ئاینێک، یا هەر بیروباوەڕێکی تر، کە رێزگرتن لێی دژی

سیستەمی گشتی وئاکاری باش نەبێت، پیادە بکەن، جا ئەگەر ئەو پیادەکردنە لەشوێنیکی گشتی یاخود تایبەتی بێت"!

ئێمە هەمووومان دەزانین لە دوای کۆنگرەی لۆزانەوە تورکیا بەشێوەیەکی چەند دڕندانە و رەگەزپەرستانە هەوڵی سڕینەوەی زمان وکەلتوور وتەنانەت نەتەوەی کوردیشی داوە!کە ئەمە بەتەواوی پێچەوانەی دەقی ئەو مادەیەی رێکەوتننامەی لۆزانە!

لەمەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە تورکیا لەساڵی 2023 نەک هەر ناتوانێت پەلاماری هەرێمی کوردستان بدات، بەڵکو ناچار دەکرێت، لەو ناوچانەش بکشێتەوە، کە ئێستا داگیری کردووە، لەبەرئەوەی دوارۆژی ئەو ناوچەیە لەبەردەم دوو ئەگەر دایە، یا دەوڵەتی ئێراق بەهێز دەکرێتەوە وقۆناغی شەڕی ساردی نوێ وەک شەڕی ساردی کۆن، مافەکانی کورد پێشێل دەکات ودەوڵەتێکی مەرکەزی بەهێز لەئێراق دادەمەزرێت، کە ئەو کاتە تورکیا نەدەتوانێت، نەهیچ بیانگەیەکی مانەوەی دەمێنێت، یاخود ئەو حالەتەی ئێستا هەیە سەقامگیر دەبێت وهاوسەنگی هێزی جیهانی وسیستەمی نوێی جیهانی، واتە سیستەمی دوای قۆناغی تاکجەمسەری، بەشێوەیەک ئەو ناوچەیە دادەڕێژێتەوە لەبەرژەوەندی کورد دا دەبێت، ئەو کاتە تورکیا هەمدیس ناچار دەکرێت لەو ناوچەیە نەمێنێت، لە هەموو حالەتەکاتدا، خەونی دروستکردنەوەی ئیمپراتۆریایەکی عوسمانی نوێ، کە بنەما بێت لەسەر ئاین ورەگەزپەرستی، خەونی حوشترە ولە دنیای ئەمڕۆدا هەرگیز نایەتە دی!.

## دادپەروەری لەسەرەخۆ وپێشێلکردنی یاسا لەهەرێمی کوردستان

### کەیسی گیراوانی بادینان وەک نمونە

2021\10\23

دواخستن وخۆگرخاندن لەداگایی کردن وحوکمدان، زیانیکی گەورە بە هەردوو لایەنی دادخواز وتۆمەتبار دەگەیەنێت، لە دادگا مەدەنیەکانیشدا داواکار وداوالێکرا و لەلایەک وحکومەت وکۆمەڵگاش لەلایەکی تر دەگەیەنێت، خۆگرخاندن ودواخستنی دادگایی کردن لەگەڵ هیچ بنەمایەکی یاسایدا ناگونجێت، لەجیاتی ئەوەی دادپەروەری بێنێتە دی، یاساو دادگاکان وەک ئامرازێک بەدەستی دەسەلاتی سیاسی نیشان دەدات، کە لەپێناو بەرژەوەندیەکانی خۆی بەکاریدەهێنێت، ئەم دوا خستن و خۆگرخاندنە پێی دەگوترێت، دادپەروەری لەسەرەخۆ، کە لەبنەڕەتدا دەبێت دادگاکان لەماوەکی دیاریکراودا کێشەکان یەکلایی بکەنەوە، ئەگینا بەپێچەوانەوە کێشەکان لەرێگا لادەبرێن وبەئاراستەیەکی ترسناک هەنگاو دەنێن. تەنانەت لەژێر سایەی رژێمێکی وەک بەعسیش، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، تێبینی ئەو حالەتە نایاساییەی کردووەو رینمایی ، بۆ دیاریکردنی ماوەی زەمەنی تایبەت بەیەکلایکردنەوەی داواکان، لەژێر ناوی (تعليمات السقوف الزمنية الخاصة بحسم الدعاوى في المحاكم- رقم التشريع: 4- سنة التشريع: 1987- تاريخ التشريع: 1987-01-01 00:00:00)، دەرکردووە ، ئەمەش بە مەبەستی جێبەجێکردنی برگەی (2) لە بڕیاری ژمارە 669 ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، کە لە 1987\8\23 دەرچووە، بەوردی ئەو زەمەنەی دیاریکردووە وتا ئێستا

کاری پێدەکرێت، کە تیایدا پێویستە دادگاکان کێشەکانی بەردەستیان یەکلایی بکەنەوە، مەبەستم لە داگاکان هەموو جۆرەکانی داگایە، دادگای مەدەنی ودادگا سزاییەکان ودادگای تەمییز، هێندەی پەیوەندی بەدادگا سزاییەکانەوە هەیە، ئەو رێنماییە دادگاکان پابەند دەکات، کە لەماوەیەکی دیاریکراودا داواکان یەکلایی بکاتەوە، لەمەشدا چەند هەڵاوێردنێکی کردووە، لەوانە هۆی دواخستنەکە پەیوەندی بە داگاکەوە نەبێت، یاخود هەندێک رێکاری تایبەتی بوێت، یاخود هەندێک کۆسپ هەبێت پەیوەندی بە ئیدارەی دادگاوە نەبێت، وەک داواکانی لێپێچینەوە وقۆنتەرانتچی وداواکانی (چاودێری بازاڕەکان (الحسبە). لەبەشی دووەمی ئەو رێنماییە، کە پەیوەندی بەدادگای سزاکانەوە هەیە، لە مادەی یەکەمدا، زۆرترین ماوەی زەمەنی، بۆ یەکلایی کردنەوەی داواکان، لە قۆناغی لێکۆڵینەوەدا، دادگای لێکۆڵینەوەی پابەند کردووە، کە لە داواکانی سەرپێچی یەک مانگ ولەداواکانی کەتن 2 مانگ ولەداواکانی تاوانکاری 4 مانگی داناوە، ئەو زەمەنەش لەو کاتەوە دەست پێدەکات، کە داواکەی تیادا تۆماردەکرێت. لە بەشی سێیەمدا، ئاماژە بەوە کراوە، کە زۆرترین ماوە بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەو داوایانەی تایبەتە بە دادگای تاوانەکان، دادگای هاتوچۆ ودادگای رێکخستنی بازرگانی ودادگای نەوجەوانان، لە داواکانی کەتن وسەرپێچیکردن، کاتێک سەیری داوای تاوانەکان دەکات، سێ مانگە، ئەمەش لەبەرواری تۆمارکردنی داواکەوە دەست پێدەکات، لەبەشی چوارەمدا بۆ وردبوونەوە لە بڕیارەکانی دادوەری لێکۆڵینەوە بە کەفالەت ویاخود ئەو بەند کردنەی لەرووی تەمیزیەوە ولەبەردەم دادگای تاوانەکان تانەی لیدراوە، سێ رۆژە، لەبەرواری وەرگرتنی داواکەوە، 6 رۆژ بۆ بڕیارەکانی تر، دادوەری لێکۆڵینەوە پابەند دەکات، لە رۆی تانە لێدانەکەدا، یاخود بەلای زۆری رۆژێک دواتر، قەزیەکە رەوانەی دادگا بکات، ئەو رێنماییە زۆرترین ماوەی بۆ دادگای تەمیز داناوە، کە لە بەشی سێیەم، خاڵی یەکەم، لقی (ه) دا هاتووە، کە 6 مانگی بۆ

لێوردبوونەوە لە داوای تاوانەکان داناوە، ئەوانەی دەستەیەکی فراوان(الهیئە الموسعە) یاخود دەستەی گشتی (الهیئە العامە) وردبینی تیادا دەکات. بەم چەشنە بەگوێرەی ئەو رێنماییە لەهەموو حالەتەکاندا نابێت یەکلایکردنەوەی داوا لە 6 مانگ تێپەڕێت، کەچی دەبینین، لە دادگای تاوانەکانی هەولێر، لە کەیسی هەندێک لەگیراوەکانی بادینان، زیاتر لەساڵیکی بەسەرداچووە وتا ئێستا داگایی نەکراون، ئەمەش پێشێلکردنێکی راشکاوانەی ئەو رێنماییە، کە وەزیری دادی ئێراقی لەساڵی 1987 ئیمزا لەسەر کردووە.

هەر بەپێی ئەو رینماییە دەسەڵات دراوەتە دەستەی سەرپەرشتیاری عەدلی، کە ئێستا لەهەرێمی کوردستان دەستەی سەرپەستیاری قەزایی، کە بەهەمان یاسای سەرپەشتیاری عەدلی دەرچووە، ئەو ئەرکە رادەپەڕێنێت وبەدواداچوون بۆ پابەند بوونی دادگاکان بە ماوەی زەمەنی دەکات، ئەمەش لەرێگای سەردانیکردنی دادگاکان وئەو داوایانەی لەلایەن خودی داگاکان ودەزگا عەدلیەکان ودەزگاکانی تری دەوڵەت وهاولاتیانەوە پێشکەشی دەکرێت، دوای ئەوە لە حالەتەکە دەکۆڵیتەوە، ئەگەر بۆی دەرکەوت دادگا ماوەی زەمەنی بۆ یەکلایی کردنەوەی داواکەی پێشێل کردووە، بابەتە بۆ وەزیری داد، کە ئێستا ئەنجومەنی دادوەری شوێنی گرتۆتەوە بەرز دەکاتەوە، پێشنیاری بۆ دەکات، کە داوەرەکە ئاگادار بکرێتەوە، لەکاتێکدا ئەگەر دادوەرەکە ئەو سەرپێچیەی دووبارە کردەوە، بەبڕیارێکی وەزیر، کە ئەنجومەنی دادوەری شوێنی گرتۆتەوە، ئەو دادوەرە بەگوێرەی یاسای رێکخستنی قەزایی ژمارە 160 ساڵی 1979، دەنێردرێتە بەردەم لێژنەی قازیەکان ولێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکرێت. کەواتە ئەو دادوەرەش، کە سەرپێچی دەکات وپابەند نابێت بە ماوەی زەمەنی دیاریکراوە، دەبێت ئاگادار بکرێتەوە ودواتر ئەگەر دووبارەی کردەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکرێت.

شایەنی ئاماژە بۆ کردنە له مادەی یەکەمی یاسای سەرپەرشتیکردنی عەدلی (الاشراف العدلی) ژمارە(124) بۆ ساڵی 1979، هاتووە، کە ئامانجی ئەو یاسایە، ئەوەیە ، زامنی ئەوە بکات دادگاکان ودەزگاکانی تری عەدلی بەئەرکی خۆیان لەجێبەجێکردنی یاساکان هەڵسن وریز لەکرۆکی یاساکان بگرن، بۆئەوەی دادپەروەری بێننە دی، هاوکات هەڵوەستە لەسەر ئەوە بکەن، کە دادوەرەکان وفەرمانبەرەکانی دەزگا عەدلیەکان چۆن ئەو بابەتانە یەکلایی دەکەنەوە، کە دەخرێتە بەردەمیان، لەرووی کارکردن وخێرایی وجێبەجێکردنەوە، زانیاری دەربارەی ئەو کۆسپانە پەیدا بکەن، کە رێ لەدادگاکان وفەرمانبەرانی دەزگا عەدلیەکان دەگرێت، بۆئەوەی نەکەونە هەڵەوە وپێشنیار وچارەسەری پێویستیان بۆ چارەسەریکردن بخاتە بەردەم. هەروەها بە دواداچوون بۆ پلانەکانی وەزارەتی داد بکات و رینوێنی قازی وفەرمانبەرەکانی دەزگاکانی عەدلی بکات وئاڕاستەیان بکات بۆئەوەی لە جێبەجێکردنی کارەکانیاندا باشترین رێگا بگرنە بەر. لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین، کە داواکاری گشتیش بۆی هەیە ئەو بابەتە بوروژێنێت داوا لە دادگا ودادوەرەکان بکات، کە لە یەکلایکردنەوەی داواکاندا پابەند بن بە ماوەی زەمەنی دیاریکراوەوە، دەبێت پارێزەرانیش، بەپشت بەستن بەو رێنماییەوە کار بکەن وبەرگری لەنمایندەکانیان (الموکل) یان بکەن.

لەکۆتایدا پێویستە ئاماژە بۆئەوەی بکەین، لە هەرێمی کوردستان زۆرجار داگاکان دەکەونە ژێر کاریگەری دەسەڵاتی سیاسی وئەو حیزبانەی دەسەڵات بەڕێوە دەبەن، لەساڵی (2011) بینیمان، کە پارتی دیموکراتی کوردستان بە دەیان داوای لەسەر رۆشنبیران تۆمار کردو داوای قەرەبوویکی لێدەکردن، کەلەهەندێک حالەتدا لە 500 ملیۆن رەتیدەدا، دادگاش ئەو داوایانەی وەردەگرت، لەکاتێکدا بەگوێرەی مادەی یەکەمی یاسای سەلماندن(قانون الاثبات)، ئەو قەرەبووەی داوا دەکرێت

دەبێت لەگەڵ بڕی ئەو زیانە بگونجێت، کە کەوتۆتەوە، بەپێچەوانەی ئەمە، ئەگەر نەگونجا وزۆر زیاتر بوو، واتای ئەوەیە، کە لایەنێک دەیەوێت داگا بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی بەکاربهێنێت! ئەمەش ێچەوانەی مەبەستی داگایەو دەبێت داواکە رەتبکرێتەوە

هەرچۆنێک بێت ئێستا لەسەر داواکاری گشتی ولێژنەی سەرپەرشتیاری قەزایی پێویستە بە دواداچوون بۆ کەیسی گیراوانی بادینان بکەن ولەلایەنی کەمتەرخەم بکۆڵنەوە وریکاری یاسایی بەرامبەر بگرنە بەر.

## داهێنانەکانی حکومەت وپەرلەمان

2021\10\28

هەر دەڵێن پەرلەمان وحکومەت داهێنان ناکەن، کە داهێنانیش دەکەن، خەڵک گلەیی دەکات، ئەی ئەوە نیە سەرۆکی حکومەت دەڵێت پیویستە فەرمانبەران داوای قەرزەکانیان لەبەغدا بکەن، ئەوان بەردەوام ناڵێن ئێمە نامانەوێ لەئێراق جیاببینەوە وتەلاقی بدەین! ئەی ریفرانۆدمیش بۆ نوێکردنەوەی گرێبەستی مارەیی ولەحیم کردنەوەی هەرێم نەبوو بە بەغدا!؟ هاولاتیانی هەرێم هاوولاتی ئیراقین، نازانم بۆ خەڵکی کوردستان تێناگات! حکومەتی هەرێم جگە لە ماف هیچ بەرپرسیاریەتیەکی بەرامبەر ئەوان نیە! دەبێت قەرزەکانیان لە بەغدا وەربگرنەوە، نیوە مووچەش لە حکومەتی هەرێم، باج بدەنە هەرێم ومووچەش لە بەغدا وەربگرن، کەس نەپرسێت، بوونی حکومەتی هەرێم لەو ناوە بۆچیە، ئەی ئەگەر حکومەت نەبێت ئەو هەموو گرێبەست وقازانجە خەیاڵیە کێ وەریبگرێت، ئەی ئەو هەموو زەویە کێ دەستی بەسەردابگرێت! ئەی پەروەردەو زانکۆکان کێ بێبەها وچرووکی بکات! بەراستی ئەوە داهینانێکی گەورەیە، داهێنانەکانی پەرلەمانیش هەر حیسابی بۆ ناکرێت، رێک لاسایی حیزبەکانیان دەکەنەوە و جوانترین زمانی گفتوگۆ بەکاردێنن، تەنانەت ئەگەر پێویست بکات ئەزیەتی زمان بەکارهێنانیش ناکێش و زمانەکان لەبنەوە دەبڕن وسواری....

# کێ دەبێت وڵات جێبهێڵێت!

2021\11\8

ئەو ئامارانەی دەربارەی شەپۆلی ئەم دواییەی کۆچی گەنجانی کورد لەباشووری کوردستان باس دەکرێت، ئامارێکی مەترسیدارن، لەوەش مەترسیدارتر ئەوەییە پێدەچێت هاندان وبێهیواکردنی گەنجان بۆئەوەی وڵات جێبهێڵن بەپلان بێت و ئەو وڵاتە لەهەموو تواناو خوێنێکی گەنج، کە بنەمای بونیاتنان وئاوەدانکردنەوەی وڵاتە خاڵی بکرێت، باوەڕناکەم هیچ دەسەلاتیک هەبیت لەدنیا ئەو هەموو گەنجە لە ولاتەکەی کۆچ بکات، ئەو مێش میوانی نەبێت!

هەموو هۆکارەکانی ئەو کۆچکردنە لەگەڕان بەدوای ئازادی ونانذا کۆکراوەتەوە، کەچی ئەو مرۆڤانەی لە دروستکردن وبونیاتنانی ولاتەکەیان رادەکەن، هەرگیز ناتوانن ئازاد بن، لەبەرئەوەی مرۆڤی ئازاد، لەدەست کۆمەڵێک خەڵکی وڵات فرۆش ودزو گەندەڵ راناکات، بەڵکو رووبەڕوویان دەبێتەوە، هۆکاری سەرەکی ئەو کۆچە شەڕێکی دەروونیە بۆ بێهیواکردن ورووخاندنی گەنجانی کورد ئەنجام دەدرێت، شایەنی سەرنجدانە بەرامبەر ئەو کۆچە، کۆچێکی پێچەوانە هەیە وبەلێشاو گەنجی نەتەوەکانی تر دەهێنرێنە کوردستان، کە ئەمە بەئاشکرا ئەوە دەسەلمێنێت، کە پرۆسەیەکی ترسناکی گۆڕینی دیمۆگرافیای هەرێمی کوردستان بەڕێوە دەچێت، بەداخەوە دەسەڵاتی کوردیش پشکی شێری لەو کارە نا نیشتمانیە بەردەکەوێت، ئەو بێدەنگیەی بەشێوەیەک

لەشێوەکان واتای ئەوەیە، هانی گەنجانی توورە دەدات بۆئەوەی ولات جێبهێڵن وبەرامبەر ئەوەش دەروازەی کوردستان بەرامبەر خەڵکانی تر والآدەکات، بۆئەوەی ئەو کەلێنەی پێ پڕبکەنەوە وهەمیشە گوێڕایەڵ وئەلقە لەگوێی ئەو بن، لێرەدا پرسیارێک دێتە ئارا، پێویستە ئەو گەنجانەی وڵات جێدەهێڵن وبەدوای بەهەشتێکدا دەگەڕێن، کە هەرگیز پێی ناگەن، لە خۆیان بپرسن، ئایا راستە وڵاتەکەیان بۆچەند وڵات فرۆش ودزو جەردەیەک بەجێبهێڵن بۆئەوەی زیاتر هەتکی نیشتمانەکەیان بکەن؟! دەکرێت میللەتێک لەبەر دەست چەند کەسێک رابکات، کە بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن!؟ ئایا لەجیاتی کۆچکردن ووڵات جێهێششتن باشتر نیە وڵاتەکەی خۆیان ئاوەدان بکەنەوە رێگا نەدەن ولاتەکەیان چیتر هەڕاج بکرێت! ئەوەی دەبێت ئەو وڵاتە جێبهێڵێت ئەوانەن، کە وڵاتیان ریسوا کردووە، نەک ئەو گەنجانەی، کە ئومێدی دوارۆژی ئەو میللەتەن!

## پرسی کۆچ کردن وپێشنیارێک بۆ چارەسەری

### پڕۆژەیەک بۆ پەرلەمانی کوردستان

2021\11\9

لەوەتەی مرۆڤ هەیە کۆچ کردن هەیە، هەندێک شوێنی جوگرافی هەیە مرۆڤ دەردەکەن وهەندێک شوێنی تر هەیە مرۆڤ رادەکێشن، کەواتە پڕۆسەی کۆچکردن پڕۆسەیەکی سروشتیەو مرۆڤ بەسروشتی خۆی، وەک هەموو بوونەوەرەکانی تر بەشوێنیکی باشدا دەگەڕێت ژیانی تیادا بگوزەرێنێت، بەڵام بەپێچەوانەی کۆچی سروشتی زۆرجاران کۆچکردن شێوازێکی سیاسی یاخود ئابووری یاخود ئاینی بەخۆیەوە دەگرێت.

لەرووی سیاسیەوە زۆر کۆچی گەورەمان هەیە لەمێژوو، مەغۆلەکان لەباکووری رۆژهەڵاتی ئاسیاوە کۆچیان کرد بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ودواتر ئیمپراتۆریای عوسمانیان دامەزراند، ئێستا خۆیان بە خاوەنی هەموو پانتایی توورانی گەورە دەزانن، کە لەتورکیاوە دەگرێتەوە تاوەکو بن دیوارەکانی چین، ئێستا بەتێپەڕبوونی کات، دەیانەوێت هەموو ئەو نەتەوانە دەربکەن، یاخود بەتورکیان بکەن، کە خاوەنی راستەقینەی ئەو زەویانەن. یاخود کاتێک هیندستان سەربەخۆیی بەدەستهیناو دواتر پاکستان لیی جیابووەوە، بەهۆی بیروباوەری ئاینیەوە نزیکەی 17 ملیۆن کەس، لەموسڵمان وسیخ وهیندۆسەکان کۆچیان کردو شوێنەکانی خۆیان

بەجێهێشت، سیخ وهیندۆسەکان چوونە هیندستان وموسڵمانەکانیش چوونە پاکستان، لەدوای راپەڕینی 1991 دەیان هەزار کورد لەترسی سەدام کۆچیان کرد وبەشێکیان دواتر گەڕانەوە وهەندێکیشیان بەیەکجاری ماڵئاواییان لە نیشتمان کرد.

لە ئێستادا کۆچکردن بۆت ئامڕازێک لەململانێیە نێودەوڵەتیەکان ووەک کارتێکی فشار بەکاردەهێنرێت بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی سیاسی، وەک تورکیا لەرێگای کۆچبەرانەوە هەڕەشە لە ئەوروپا دەکات ولەم رێگایەشەوە توانیویەتی ئامانجی سیاسی وئابووری زۆر گەورە بەدەست بێنێت، یاخود بێلاروسیا، کە ئێستا کارتی کۆچبەرەکان وەکو فشارێک دژی یەکێتی ئەوروپا بەکاردەهێنێت، دیارە ئەو دەرگایە بۆ کورد، کە لەناوەوە کۆمەڵێک فشاری سیاسی وئابووری ودەروونی لەسەر دروست کراوە، دەرفەتی ئەوەی رەخساندووە هەناسەیەک وەربگرێت وبەم چەشنە ئەو شەپۆڵەی کۆچکردن لە هەرێم دەستی پێکردووە! بۆئەوەی لەدۆزەخێکەوە رابکات، وەک وێنای بۆ کراوە، بچێتە بەهەشتێک، کە خەونی پێوە دەبینێت وبەدەیان شێواز لەبەردەمی ئارایشت وجوان کراوە!

ئەوەی مەترسی ئەو کۆچە زیاتر دەکات، ئەوەیە لەکۆچێکی ئابووری سیاسیەوە خەریکە دەگۆڕێت بە پڕۆسەیەکی بازرگانی وبازرگانیکردن بەمرۆڤ، ئێستا سەرباری ئەوەی گەنجانی کورد وڵاتیان بەجێدەهێڵن وئاوارە دەبن، کراون بەکاڵایەکی بازرگانی، کە لەدواجاردا دەبن بەتوێژێک لەکۆیلەی نوێ! لەبەرئەوەی لە بنەرەتدا سیستەمە رۆژئاواییەکان، بەهۆی گەشەسەندنی بیری توندڕەوی ناسیونالیستی، خەریکە وەکو کۆیلەیەکی نوێ ودەستی کاری نوێ مامەڵە لەگەڵ

کۆچبەرەکان دەکەن، لێرەدا کۆچبەری کورد دەکەوێتە نێو دوو دۆخی دژ بەیەکەوە ودووچاری نامۆبوون دەبێت، ئەویش ئەوەیە نە وڵاتەکەی ئەو دۆزەخەیە، کە میدیاکان ووەک شەڕێکی دەروونی لەسەر ئاستی ناوەخۆ وهەرێمی وجیهانی لەگەڵی دەکرێت، نە رۆژئاواش ئەو بەهەشتەیە، کە خەونی پێوە دەبینێت، بۆیە لەجیاتی کۆچکردن وڵات بەجێهێشتن، باشتر وایە کار لەسەر ئەوە بکرێت، دۆخی ناوەخۆ باشتر بکرێت، دەتوانرێت لەلایەنی ئابووریەوە هەنگاوی باش بنرێت، بەڵام لەرووی سیاسیەوەو هەنگاوەکە ئاستەنگترە، چونکی دۆخی هێزەکانی هەرێم گەیشتۆتە ئاستێک توانای گوێگرتن ومامەڵەکردنیان لەگەڵ دۆخێکی ئاوادا تا رادەیەکی زۆر لەدەست داوە، هۆکاری بنەڕەتی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ نەمانی متمانە بێئومێد بوونی هاوڵاتیان، بەهێزەکانی کوردستان، بەدەسەڵات وئۆپۆزسیۆنەوە، بۆیە دەبێت سەرەتا لە دەروازە ئابووریەکەوە مامەڵە بەگەڵ ئەو کێشە گەورەیە بکرێت!.

لەرووی ئابووریەوە پێویستە پەرلەمانی کوردستان دەست بەجێ کار لەسەر دەرکردنی پرۆژە یاسایەک بکان، کە پێشینەی کار بداتە گەنجەکان ودەستی کاری هەرێم! ناکرێت کەسێک لەوپەڕی دنیاوە بێت لێرە کاری دەست بکەوێت هاوڵاتیەکی ئێرە کاری نەبێت ووڵاتەکەی جێبهێڵێت. دەبێت لەو دۆخە تێبگەین، کە ئەو کرێیەی کرێکارێکی بێگانە وەریدەگرێت، کە تا رادەیەکی باش شوێنی حەوانەوە وخواردنی بۆ دابینکراوە، لەگەڵ کرێکارێکی کورد، کە هەموو ئەو ئەرکانەی دەکەوێتە ئەستۆ، ئەمە جگە لەوەی نرخی ئەو پارەیەی کرێکاری بێگانە لێرە وەریدەگرێت، بە بەراورد لەگەڵ وڵاتەکانی خۆیاندا زۆر دەبێت، واتە

جۆرە بەراوردێک لەو کرێیە هەیە لەنیوان هەرێمی کوردستان وئەو وڵاتانەی لێیەوە هاتوون، ئەو بەراوردە بۆ کرێکاری کورد نیە، بۆیە دەبێت پەرلەمانی کوردستان لەریگای یاساوە وئەنجومەنی وەزیران لەرێگای جێبەجێکردنی ئەو یاسایە بەدڵسۆزیەوە، هەوڵ بدرێت کۆمپانیاکان ناچار بکرێن، کرێکار ودەستی کاری کوردی بەکاربهێنن، ئەگەر لەرووی لێهاتووی وکارامەییەوە ناچاربن کرێکاری بێگانە بێنن، دەبێت ئەو رێگا پێدانە هەر بۆماوەیەک بێت وکۆمپانیاکان ناچاربکرێن، کە کرێکاری کورد رابهێنن وبیاننێرنە دەرەوەی وڵات بۆئەوەی خولی پێویست وەربگرن تاوەکو بۆ هەموو جۆرە کارێک ئامادە بکرێن، هاوکات کرێی ئەو کرێکارانە، چ کرێکاری تەکنیکی بن، یاخود ئاسایی، لەلایەن وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتیەوە دیاری بکرێت وتیایدا رەچاوی ئاستی ژیانی لەکوردستان تیابکرێت، ئەمەو زۆر شتی تر دەتوانرێت لەو چوارچێوەیە بکرێت لە قۆناغی ئێستادا ئەنجام بدرێت.

## نەخوێندەواری وناهوشیاری وبەخوا کردنی سەرۆک...!

2021\11\21

ڕەنگ بێت یەکێک لەو شەڕە مەترسیدارانەی لە هەرێمی کوردستان دەگوزەرێت، شەڕی چرووک کردنی خوێندن وپەروەردە ولەو ڕێگەیەشەوە نەزان وگەمژەکردنی خەڵکی کوردستانە، واتە شەڕی خوێندن وپەرروەردە ئامڕازێکە بۆ بڵاوکردنەوەی نەزانی وبەرهەمهێنانی کۆمەڵگایەکی نەخوێندەوار وگەمژە، کە لەکۆتایدا توانای ڕووبەڕوونەوەی نادادپەروەریەکان وتەنانەت داگیرکەرانیشی نامێنێت!

لەچیرۆکی نەمروود دا وانەیەکی زۆر بەپێز لەم بارەیەوە هەیە، کاتێک نەمروود دەچێتە لای یەکێک لە وەزیرەکانی پێی دەڵێت، بەراستی ئەو خەڵکە نەزانن، باوەڕیان کردووە، کە من خوام! وەزیرەکەش ژیرانە وەڵامی دەداتەوە وپێی دەڵێت، کەواتە پێویستە بەهەموو توانایەکتەوە پارێزگاری لەو نەزانیە بکەیت! لەبەرئەوەی ئەگەر میللەت نەزان نەبێت هەرگیز وەکو خوا سەیری سەرۆکەکەی خۆی ناکات! لە سەردەمی نوێشدا لە سەرۆکی لیبیایان پرسی بۆچی بایەخ بەپەروەردەو خوێدن نادەیت، لە وەڵامدا گوتی ئەگەر خەڵکی زانا وخوێندەوار بن، شۆڕش وکودەتا دژی من بەرپا دەکەن، ئەو کەسەی پرسیارەکەی لێکرد، گوتی ئەگەر گەلێکی هووشیار شۆڕشت لەدژ بکات، باشترە لەگەلێکی نەخوێندەوار، کە تەڕو وشک بەیەکەوە دەسووتێنێت! بینیمان، کە گەلێکی ناهوشیار چیان لەقەزافی کرد!

ئەوە یەکێک لەو هۆکارە سەرەکیانەیە دوای دەیان ساڵ کارکردن، هەر کاتێک گەل لەو جۆرە وڵاتانە رادەپەڕێت تەڕو وشک بەیەکەوە دەسووتێنێت ودەیگەڕێنێتەوە بۆ خاڵی سفر، لەراپەڕینی باشووری کوردستان و رزگارکردنی ئێراق وشەڕی سوریا ویەمەن و... هتد بینیمان، گەل چۆن بەناوی شۆڕش و رزگاریەوە هەموو شتێکی ولاتەکەی وێران وفەرهود کرد.

لەکوردستان بەگشتی وهەرێمی کوردستان بەتایبەتی بەشێوەیەکی سیستەماتیک کار لەسەر نەزانکردنی خەڵک وبێبەهاکرنی خوێندەواری وبڕوانامە دەکرێت، لەمەشدا بەرژەوەندی بەناو سەرکردەو بەرپرسە کوردەکان لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان یەکدەگرێتەوە، بۆئەوەی لەلایەک مانەوەو بەخوا کردنی سەرۆکەکان مسۆگەر بکرێت، لەلایەکی تر داگیرکەران بتوانن پلانەکانی خۆیان وردتر لەسەر ئەو کۆمەڵگایە جێبەجێبکەن وئیرادەی بەرەنگاربوونەوەیان لانەهێڵن. کەواتە ئەوەی لە هەرێمی کوردستان دەگوزەرێت لە بێبەهاکردنی خوێندن وپەروەدە، کارێکی رەمەکی نیە وبەوردی پلانی بۆ داڕێژراوە، بێبەهاکردنی خوێندن وسووکردنی دەستەبژێری زانستی، تەنیا لەبەرژەوەندی ئەوانەدایە، کە دەیانەوێت بەهەرشێوەیەک بێت، چۆن لەسەر پشتی دەبابەی داگیرکەران هاتنە سەرکورسی دەسەڵات ولەپەنای ئەواندا ماونەتەوە، بەهەمان شێوە، لەسەر پشتی نەزانی خەڵکیش درێژە بە بەرژەوەندیەکانیان بدەن، منداڵەکانی خۆیان دەنێرنە باشترین زانکۆکانی جیهان، کەچی وڵاتەکەی خۆیان پڕ دەکەن لەخاوەنی بڕوانامەی ساختە ونەخوێندەوار، ئەمەیە وایکردووە دۆخی زانست

وزانکۆکانی کوردستان بگاتە ئەو ئاستەی تیایدایە، تێکشکاندن وچرووک کردنی بڕوانامە ودەستەبژێری زانستی، واتای ڕێگا گرتنە لەسەرهەڵدانی کەسانی دڵسۆز وراستەقینە، کە بتوانن، پێشڕەوایەتی خەڵک بکەن ولەشەوە ئەنگوستە چاوەکاندا دەربازی بکەن!

بەدەیان زانکۆی نەزانکۆ لەکوردستان کراوەتەوە، کەچی دۆخی خوێندەواری وزانست لەکوردستان ڕۆژ بەرۆژ لە پاشەکشەدایە، لەبەرئەوەی خودی کردنەوەی ئەو هەموو زانکۆیە، بەشێکە لەپڕۆسەی بەرهەمهێنانی نەزانی وریسواکردنی زانست لەو وڵاتەدا!.

ئێستا لەمیدیاکانداتەنیا  قسە لەسەر بڕوانامە ساختەکانی لوبنان دەکرێت، لەکاتێکدا لەتورکیا وئێران ومیسرو قوبرس وتەنانەت زۆر لە وڵاتانی رۆژئاوا و تەنانەت زانکۆکانی ناوەخۆشدا، بەدەیان وبگرە بەسەدان بڕوانامەی ناو گەورەو ناوەڕۆک بەتاڵ، کە بەشێکی زۆری بەپارە کڕدراون یانووسراونەتەوە، دەهێنرێتە کوردستان، بەشێکی زۆر لە بەرپرسە نەخوێندەوارەکان دەیانەوێت وشەی شۆڕشگێڕ ، کە باوی نەماوە، لەخۆیان داماڵن وشەی دختۆر لەجێگای دابنێن، ئەم مەهزەلەیە ئێستا کاریگەری بەرونی دیارە، بەڵام دوای چەند ساڵێکی تر ئینجا تراژیدیا کارەسات ئامێزەکەی بەدیار دەکەوێت!.

## خوێندکارەکان ئازارمەدەن ومافەکانیان بگەڕێننەوە

2021\11\22

چەند رۆژێکە لە ناوچەی سەوز خۆپیشاندان وناڕەزایەتی لەلایەن خوێندکارانەوە دەستیپکردووە، بۆئەوەی دەرماڵەکانیان بۆ بگەڕێننەوە، کە هەروەک چۆن بڕین ولێبڕین وپاشەکەوتکردن وخۆگونجاندنی مووچەی فەرمانبەران کارێکی نایاساییە، دەرماڵەش سەرەتایترین مافە بۆ ئەو کەسانەی بەدوای خوێندن کەوتوون وتەمەنی خۆیان بۆ خزمەتکردنی ولاتەکەنیان تەرخان دەکەن، کۆمەڵگای کوردی هەرگیز نەیهێشتووە خوێندکارەکانی بێ بژێوی ژیان بن ولەسەر خوانی مال ومناڵی خۆیان گرتۆتەوە وبۆ فەقێ وقوتابی و مزگەوتەکانیان بردووە، تا ئێستاش جێگای داخە ژیانی بەشێکی زۆری مامۆستایانی ئاینی لەسەر شانی جووتیاران وخەڵکی هەژاری لادێکانە.

داواکردنی دەرماڵە، مافێکی سەرەتایی ودەرئەنجامی ئەو ناعەدالەتیە کۆمەلاتیەیە، کە رۆژ بەرۆژ لەهەرێمی کوردستان زیاتر وفروانتر دەبێت، خەریکە دەگاتە ئەو رادەیەی دەسەلاتداران وپیاوەکانیان دەبنە خاوەنی هەموو شتێک وزۆربەی خەڵکی کوردستانیش هەموو شتێک لەدەست دەدات! ئەمە ئەو ئابووری ئازادەیە، لیبڕاڵە نوێیەکان بانگەشەی بۆ دەکەن!

حکومەتی کوردی هەموو ئەو برە یەکسانی وسوسیالیستیەی رژێمێکی وەکو بەعسیش هێنایە دی، لە دابینکردنی مافی خوێندن وچارەسەری ودامەزراندن وخانەنشین بوون بەیەکسانی، خەریکە لەناو دەبات، پێشتر منداڵی هەژار لەرێگای خوێندنەوە دەیتوانی وەکو دەڵێن بگاتە نانی خۆی، بەڵام ئێستا هەموو رێگایەکی نان پەیدا کردنیان لێگیراوە، بخوێنێت ونەخوێنێت تا رادەیەکی زۆر وەکو یەکی لێهاتووە، زانکۆکان بوونەتە رێگایەک بۆ پارەپەیداکردن وبەخشینەوەی بڕوانامە ونازناوی زانستی بەنەخوێندەوار ونەزانە حیزبیەکان، منداڵی هەژاریش دەبێت بۆ تەنیا دەرماڵەیەکی بچووک، کەبەشی تەنیا ژەمێکی منداڵی نابەرپرس ودز وگەندەڵەکان ناکات، بڕژێتە سەر شەقام وهێزە ئاسایشەکان بەناوی پاراستنی حکومەتی کوردیەوە دارکاری بکەن ودواتر لەکونجی زیندانی بئاخنن، ئەو جۆرە حکومەتە لەکوێی دونیا هەیە، کە دزو گەندەڵ وپیاوکوژ وتاوانبارەکان، وەکو پیاوماقووڵ وکەسایەتی بخرێنە پێشەوەی کۆمەڵگاو خوێندکارێکی سادەی لەخۆبووردووش ناچار بێت، ئەو هەموو ئازارە بچێژێت، تەنیا بۆئەوەی مافیکی سەرەتایی بۆ بگەڕێنرێتەوە!

لێرەدا بەهەموو شێوەیەک پاڵپشتی خۆم بۆ داوا رەواکانی خوێندکاران دەردەبڕم وداوا لەحکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەم، بەزووترین کات بەپیر داواکەیانەوە بێت وبەبیانووی نەبوونی پارە ئەو داوایە دوا نەخات، چونکە ناکرێت پارە بۆ کوڕی بەرپرس ومنداڵەکانی خۆیان هەبێت ومنداڵی هەژاریش لەدوورەوە سەیریان بکات! دڵنیاش بن، ئەو خۆپیشاندانانە سەرەتایەک دەبێت بۆ خۆپیشاندن وتۆڵەکردنەوەیەکی گەورەتر، کە رۆژێک دادێت تەڕ ووشک بەیەکەوە دەسووتێنێت، ئەو کاتە

نەتورکیا ونەئیران ونەئەمریکاش ناتوانێت لەژێر چەپۆکی توورەیی خەڵک

رزگارتان بکات!

# زەنگەکە لێدەدات وکەسیش گوێ نادێرێت

2021\11\27

هەرێمی کوردستان، بەتایبەتی ناوچەی سەوز لەبەردەم ئالۆزی وتەنانەت ئەگەرێکی بەهێزی شەڕێکی کوردی کوردی دایە، دەستپێکردنی ئەو شەڕە رۆژ بەرۆژ نزیکتر دەبێتەوە، لەکاتی دایسانی شەڕێکی لەو شێوەیەشدا هیچ گرەنتیەک نیە، کە شەڕەکە تەشە نەسەنێت وهەموو هەرێمی کوردستان نەگرێتەوە!.

جێگای داخە دوای زیاتر لە سی ساڵ، کە دەبوایە ئێستا هەرێمی کوردستان ناوچەیەکی سەقامگیر ودەوڵەمەندی ناوچەکە بێت، کەچی گەیشتۆتە ئاستێک هەر رۆژەی بوومە لەرزەیەک دەیگرێتەوە، راستە کاریگەری هێزە هەرێمیەکان لەبەرچاوە، بەڵام بەرپرسی یەکەم لەو دۆخە بەشێوەیەکی سەرەکی حکومەتی هەرێم، یاخود راستتر هەردوو حیزبی سەرەکی پارتی دیموکراتی کوردستان ویەکێتی نیشتمانی کوردستانە وهەموو حیزبە فەرمیەکانی تری هەرێم بەشێوەیەک لەشێوەکان لینکێکیان لەو بەرپرسیاریەتیەدا هەیە!.

ئەوەی گومانی تیا نیە ناکۆکیەکان گەیشتۆتە رادەیەک، بەتایبەتی ئەو ناکۆکیانەی سەرئەنجامی دۆخی ئابووری وناعەدالەتی کۆمەڵایەتی وسیاسیە، گەیشتۆتە ئاستێک، کە تەقینەوەی دۆخەکە لە هەر چرکە ساتێکدا بێت مسۆگەر بووە وبەرپێگرتنی بەو خەمساردی وشێوازە

کارکردنەی ئێستای حکومەتی هەرێم کارێکی زۆر ئاستەنگە، کەواتە بۆ تەقینەوەی دۆخەکە ئێمە دەبێت چاوەڕوانی چرکەکانی کاتژمێر بین، تروسکەی گلۆپێکی سەوز لەسەر ئاستی زلهێزە رکابەرەکانی ئەو ناوچە، دەبێتە هۆی دەستپێکردنی راپەڕینێکی سەرتاسەری، کە هەموو ئاماژەکان بۆئەوە دەچن راپەڕینێکی خوێناوی کارەسات ئامێز بێت، بەکورتی ئەو هەرێمە لەبەردەم دۆخێکی نەخوازراودایە!.

ئەگەر گریمانی ئەوە بکەین هۆی ئەو گژیانە تەنیا هەوڵێکە لەلایەن کوڕەکانی تاڵەبانیەوە بۆ باڵکردن وسەرکوتکردنی ئەو سەرانەی لەناو مەنجەڵەکەی ئەواندا جێگەیان نابێتەوە، ئەوە ئەو هەوڵە لەکاتێکی حسێب بۆ نەکراوی وادایە، کە سەری ئەوانیش لەناو مەنجەڵی خەڵکدا جێگای نەماوە، بەو ترس وتیرۆر وتۆقاندنەی پیادەی دەکەن دۆخەکە نەک هەر کپ ناکاتەوە، بگرە خەستتری دەکات، پارتیش ناتوانێت تاسەر لەژێرەوە پاڵپشتی کوڕەکانی تاڵەبانی بکات ولەرووکەشیشدا خۆی بێئاگا نیشان بدات، یاخود لەدوورەوە سەیری بکات، درەنگ بێت زوو بەدەستی خۆی یاخود بێدەستی خۆی رادەکێشرێتە نێوگەمەیەکی خوێناوی مەترسیدار، کە هەرگیز پێشبینی نەکردبێت، لەبەرئەوەی تووڕەیی وبێزاری خەڵک لەدەڤەری زەردیش، ئەگەر لەتووڕەیی وبێزاری دەڤەری سەوز زۆر زۆرتر نەبێت، هەرگیز کەمتر نیە!. ئەو کارانەی لەماوەی سی ساڵی رابردوودا بەرامبەر میللەتی کورد لەباشوور وتەنانەت هەموو کوردستان ئەنجامیان داوە، رەنگ بێت لەماوەیەکی نزیکدا بەرەکەی بڕننەوە!.

## لەچاوەڕوانی کۆتاییە کۆمۆتراژیدیاکەدا ...!

2021\12\4

زیاتر لە سی ساڵە نەتوانرا هێزێکی یەکگرتوو دروست بکرێت، کە بتوانێت بەرگری لەخاک وخەڵکی کوردستان بکات، دوای سی ساڵ تاوەکو ئێستا باسی هێزی فڵان وفیسار کەس دەکرێت، تاوەکو ئێستا وەکو سەد ساڵ بەرلەئێستا بەرپرسە ترسنۆک ونمایشکارەکان خۆیان لەژێر چەک وتفاق حەشار دەدەن ولەراکردنیشدا لەپێشەوەن، تاوەکو ئێستا، کاتێک بەرپرسێک دەچێتە بەرەیەکی شەڕ، ئەو هێزەی پارێزگاری لێدەکات وئەو چەک وتفاقەی لەگەڵ ئەو هێزەدایە، زۆر زیاترە لەو هێزانەی بەسکی برسی ونەبوونی چەکی پێویستەوە بەرەکانی پێشەوەیان گرتووە!

چ کارەساتێکە دوای سی ساڵ، هەموو دنیا چەکت بداتێ ولەپێناو بەرژەوەندیەکانی خۆی بەکارت بێنێت، کەچی هێندە چەکەت نەبێت بتوانی بەرامبەر چەند چەکدارێک بەرگری لەهاوڵاتیانی خۆت بکەی!ئەوەی ئێستا دەگوزەرێت رووخان ودارِمانی تەواوە، ئەوەی پێی دەڵێن ئەزموونی هەرێم بەتەواوی دارِماوە وئەوەی رایگرتووە تەنیا بەرژەوەندی زلهێزەکان ونەخشەی هاوسەنگی هێزی ناوچەکەیە، وەک چۆن ئەوەی پێی دەگوترا شۆڕشی ئەیلوول لەساڵی (1972) دارِمابوو، دواتر شەڕی عەرەبی ئیسرائیلی لەساڵی (1973) درێژەی بەتەمەنی دا، بۆئەوەی کورد

وەک داردەستێک بۆ لاوازکردنی بەرەی عەرەبی، بەتایبەتی ئێراق بەکاربێنن، پاشان لە ساڵی (1975) کارەکەیان پێ تەواو کردن وچوار ملیۆن دۆلاریان وەک بەخشیش دایە سەرکردایەتی ئەو کاتە، ئێستاش رێک بەهەمان شێوە، دۆخەکە بەتەواوی داهێزراوەو پاشا گەردانیەکە گەیشتۆتە ترۆپک، دادگاکان، زانکۆکان، پەروەردە، بەها کۆمەڵایەتیەکان، ئینتما بۆ نیشتمان، ئومێدبوون بەدوارۆژ هەمووی دارماوە، کار گەیشتۆتە ئەو رادەیەی میللەتێک دوای ئەوەی دەریایەک خوێنی بۆ ئازادی بەخشیوە وبەدەیان ساڵ گەنج ورۆڵەی خۆی بەناوی رزگاری نیشتمانەوە کردۆتە قوربانی، ئێستا تاکە هیوای ئەوەیە ئەو دەسەڵاتە بڕوات وئەو ئازادیە نەمێنێت، کە قێزەون کراوە، دەبێت ئەو گەلە چی بەرامبەر کرابێت لەماوەی سی ساڵی ئازادیدا، کە لەئازادیەکانی رابکات!.

جێگای داخە ئەو هێزەی، کە سی ساڵە قارەمانانە شەڕی ناوەخۆ دەکات ورۆڵەی کورد دەکوژێت، بۆتە هێزێک، کە وا دێتە بەرچاو تاتیبەتمەندی تەنیا بووبێتە شەڕی ناوەخۆ وداپلۆسینی خۆپیشاندەران وگرتن وسەرکوتکردنی خەڵکی ناڕازی، ئەو سوپایەی سی ساڵە لەسەر حیسابی خەڵکی کوردستان بەخێو دەکرێت، نەیتوانیوە لەیەک شەڕیش سەرکەوتن بەدەست بێنێت، لە شەنگال، لەگوێر، لە مەخمور، هەزاران چەکداری کوردی بەرامبەر چەند سەد چەکدارێکی داعش خۆیان نەگرت، رایانکرد ونەک بەتەنیا ژن ومنداڵی برائێزیدیەکانیان نەدایە دەست ئەو هێزە، بگرە خەریک بوو لە پایتەختی هەرێمی کوردستانیش، ماراسۆنی سەربازی دەست پێبکەن، لە کەرکوک، دوای ئەو هەموو خۆبادان

ودروشم بەرزکردنەوەی سەرکردەکانی کورد، ئەو هێزە نەیتوانی تەنیا ڕۆژێک بەرگری لەکوردستان بکات!.

کەواتە لەبنەڕەتدا ئەو هێزە بۆ پاراستنی کوردستان دروست نەکراوە ودەبێت تاکی کوردی لەوە تێبگات و بیر لەدروستکردن، یاخود ڕێکخستنەوەی ئەو هێزە بەشێوەیەک بکات، کە بەکردەیی ببێتە هێزی پێشمەرگەی کوردستان، نەک تەنیا بەناو هێزی کوردستان بێت وبەکردەیش هێزی فلان وفیسار بێت وبەناوی کوردستانەوە بەرگری لەبەرژەوەندی چەند هێزو لایەنێک بکات، کە بوونەتە داردەستی دوژمنانی کوردو لەپێناو مانەوە وپاراستنی سەرو ماڵی خۆیان هەموو شتێکیان تەسلیمی دوژمنانی کوردستان کردووە!

جێگای داخە لەئێستادا هەموو شتێک دارماوە، تەنیا گەندەڵی ودزی وڵات فرۆشی نەبێت، ئێستا ئەو سێکوچکەیە لە هەموو کایەکانی تری کۆمەڵگای کوردی بەهێزتر وکاراتربووە، بۆیە هەرکاتێک هاوسەنگیەکە گۆڕا، کە لە گۆڕانێکی خێرادایە، دیسان کاتی ئەوە دێت، بنەماڵەکان بخرێنەوە ناو سارنجۆک وسەرکردە کارتۆنیەکان لەشوێنێک بپارێزرێن، بۆئەوەی لەکاتێکی تردا ودزی گەلەکەی خۆیان وەکو ئێستا بەکاریان بهێننەوە! دیسان دەبێت مێژوویەکی ساختەو پڕ درۆ ولەژێر کاریگەری بیرێکی ناسیونالیستانەی گەمژانە بنووسرێتەوە، دزو چەتە وڵات فرۆشەکان بکرێنەوە قارەمانی مێژوویی ووو..... هێزەکانی دونیا ودەوروبەیش بەوە تاوانبار بکرێن خیانەتیان لە کورد کردووە! بەم چەشنە ئەو مێژووە سیزیڤیە بەردەوام دەبێت تا ئەو کاتەی فێر دەبین مێژووی خۆمان وەک ئەوە بنووسینەوە، کە هەیە، ئەو مێژووە بەردەوام

دەبێت تاوەکو لەکرۆکی یاریە قێزەونەکە تێدەگەین وفێردەبین مێژووی خۆمان بخوێنینەوە وەک ئەوەی هەیە، نەک وەک ئەوەی بۆمان دەنوسرێتەوە وتەلقینمان پێدەدرێت!.

## سەردانەکەی مەکگۆرک وسەرەتای قۆناغێکی نوێ!

2021\12\15

سەردانی ئەم جارەی مەکگۆرک بۆ هەولێر، لەلایەک لەدۆخێکی ئاڵۆزدا بوو، لەلایەکی تر ئاماژەیەکی روونی بۆ گۆڕینی پێگەی دەسەڵات لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو، دەربارەی دۆخە ئاڵۆزەکە، بۆ هەموو لایەک روونە، کە زیاتر لە دوومانگە هەڵبژاردن کراوە وبەشێکی زۆر لەهێزە گەورەکانی شیعە دانی پیانانێن، کەواتە ناوماڵی شیعە یەک نیە وپەرتەوازەیە! بەرامبەر ئەمەش ناوماڵی کورد زۆر لەیەکتر ترازاوە وهەردوو حیزبە باڵادەستەکەی کوردستان بەجیا دانوستان بۆ پێکهێنانی حکومەت دەکەن ولەسەر زۆر مەسەلەدا یەک دەنگ نین، رەنگ بێت لەدیارترینیان لە ئێستادا، دیاریکردنی کەسێک بێت بۆ پۆستی سەرۆک کۆمار. یەکێتی تاوەکو ئێستا مکوڕە لەسەر هەڵبژاردنەوەی بەرهەم صالح وپارتیش، بەتایبەتیش سەرۆکی پارتی وا پێدەچێت لەسەر ئەو کەسە رازی نەبێت، پەیامەکەی ئەو دواییەی پارتی، کاتێک دوو کورسی پەرلەمانی لەدەست دا: (دوو کورسیەکە بەرانبەر کورسی سەرۆک کۆمار) پەیامێکی روون بوو بۆ بەرهەم صالح، هاتنی مەکگۆرک بۆ کۆشکی سپی بەشێوەیەک لەشێوەکان پاڵپشتیەک بوو بۆ بەرهەم صالح وهەردوای ئەو سەردانە یەکێتی دووپاتی کردەوە، کە تاکە کاندیدی حیزبەکەیان بۆ ئەو پۆستە هەر بەرهەم صالحە!.

ئەوەی لەو ناوەدا یەکدەنگە، سوننەکانن، کە سەرباری جیاوازی نێوانیان گەیشتنە رێککەوتن لەسەرئەوەی شاندێکی هاوبەش بۆ دانوستانەکانی پێکهێنانی حکومەتی ئێراق پێکبهێنن، یەکبوونی ماڵی سوونە ئاماژەیەکی مەترسیدارە بۆ ئایندەی ئێراق وگەڕاندنەوەیان بۆ

سەر کورسی دەسەڵات! ئەو گۆڕانانە بەتایبەتیش لەکاتێکدایە، کەوا ڕێکخراوی داعش، کە ڕێکخراوێکی ئایدیۆلۆژی سوننەیە، بووژاوەتەوە وخەریکە خۆی لەسەر گۆڕەپانی ئێراق دەسەپێنێتەوە! ئەمە وا دەکات ئەگەری دووبارە بوونەوەی سیناریۆی ئەفغانستان لەئێراق ئەگەرێکی بەهێز بێت، لەبەرئەوەی ئەو دیموکراسیە کارتۆنیەی زیاتر لە 18 ساڵە، واتە لەدوای رووخانی رژێمی بەعسەوە دەهۆڵی بۆ دەکوترێت، دووچاری شکستێکی کەمەر شکێن بووەو ناتوانێت ئەو ئێراقە بۆ ئەمریکیەکان بێنێتە بەرهەم، کە بەرژەوەندیەکانیان بپارێزێت.

هێندەی پەیوەندی بەکورد هەیە، ئەو سەردانەی مەکگۆرک چەند ئاماژەیەکی روونی لەخۆوە گرتبوو، سەرەتا هاتنی مەکگۆرک بۆ هەولێر وسەردانیکردنی کوڕەکانی تاڵەبانی لەکۆشکی سپی، پەیامێک روون بوو، کە کاریگەرییەکانی سەرەڕۆیی ریفراندۆم بەکۆتا نەهاتووەو ئەوانەی بەپێچەوانەی سیاسەتی ئەمریکا ئەو هەنگاوەیان نا، کاتی ئەوە هاتووە باجەکەی بدەن! فەرامۆشکردنی سەرۆکی پارتی وسەرۆکی حکومەتی هەرێم، ئاماژەیەکی روون بوو لەمبارەیەوە، ئەمە جگە لەوەی سەرۆکی هەرێمیش خۆی چووە کۆشکی سپی بۆئەوەی لەگەڵ مەکگۆرک کۆببێتەوە، کە لەرووی ئەتەکێتی دیپلۆماسیەوە، تەنانەت لەرووی ئەتەکێتی بنەماڵەی بارزانیشەوە، جۆرێک لە بچووکبوونەوە وبچووککردنەوەی پێوە دیارە، دیارە سەرۆکی هەرێمی ئێستا لەکاتی ریفرانۆمدا بەشێوەیەکی راستەوخۆ وناڕاستەوخۆ ئاماژەی روونی دەنارد، کە ئەو لەگەڵ ریفراندۆمدا نیە ولە قەیرانەکانی دوای ریفراندۆمیش رۆڵی سەرەکی درایە ئەو، ئەو هەڵوێستەی مەکگۆرک لەکاتێکدایە، کە میدیاکانی ئەمریکا شەقامی ناوەخۆی کوردستانیان بەمەسەلەی ڤیللا 18 ملیۆنیەکەی سەرۆکی حکومەتەوە خەریک کردووە، مامەڵە کردنی

مەکگۆرک بەو شێوەیە وبڵاوکردنەوەی ئەو بەڵگانە دژی سەرۆکی حکومەت، رێی تێناچێت هەروا بەرێکەوت بێت، رەنگ بێت یەکێک لەدەرهاویشتەکانی گەڕاندنەوەی کاندید کردنی بەرهەم صالح ووەرگرتنەوەی پۆستی سەرۆک کۆمار بێت، کە ئەمە پێچەوانەی ئیرادەی بارزانیەو دەیەوێت لەرێگای مامەڵەکردن بەو کورسیەوە هەژموون وبالا دەستی خۆی لەسەر گۆڕەپانی سیاسی ئێراق وهەرێمی کوردستان بسەپێنێتەوە، کە ئەمە ئەگەر لە قۆناغەکانی تر تا رادەیەک ئاسان بوو بێت، لەقۆناغی ئێستادا رەنگ بێت وا ئاسان نەبێت رێگەیەک بێت بۆ دوورخستنەوە ودەرکردنی سەرۆکی پارتی وکورەکەی لەگۆڕەپانی سیاسی ئێراق وتەنانەت هەرێمی کوردستانیش، واتە کورسی سەرۆک کۆمار دەبێتە ئامرازێک بۆ سەپاندن ولێسەندنەوەی هەژموونی لەنێوان ئەمریکاو بەشێک لەبنەماڵەی بارزانی! ئەلتەرناتیڤی دیاریکراویش پێدەچێت لەم قۆناغەدا سەرۆکی هەرێم، واتە برازای سەرۆکی پارتی وئامۆزای سەرۆکی حکومەت بێت، کە بەپێی خۆی کۆشکی سەرۆکایەتی هەرێمی بەجێهێشت وبەرەو کۆشکی سپی یەکێتی چوو بۆ دیدەدەنی مستەر مەکگۆرک، ئەو مەکگۆرکەی، کە لەرۆژانی ریفرانۆمدا مام وئامۆزاکەی ئامادە نەبوون بیبینن!.

هەرچۆنێک بێت دەکرێت لەئایندەیەکی نزیکدا گۆڕانکاری دراماتیکی لەسەر گۆڕەپانی سیاسی ئێراق وهەرێمی کوردستان رووبدات، قۆناغەکەش گەیشتۆتە ئاستێک چیتر بەرگەی دواخستنی قەیرانەکان وچارەسەرکردنی قەیران بەقەیران ناگرێت.

## جوانیەکان لە دوا چرکەکانی ساڵدا

30\12\2021

هەندێک رووداو هەیە، سەرباری کارەستباری وئێش وئازاریان، دنیایەک جوانی دەردەخەن ونیشانی دەدەن، کە رەنگ بێت بۆ ماوەیەکی زۆر کار لەسەر ناشیرینکردنی ئەو جوانیانە کرابێت، یاخود بەهۆی ماندوون وشەڕی راگەیاندنەوە، کۆمەڵگا وەکو پێویست بایەخی پێنەدابێت، یاخود چاوی نەیبینیبێت، کە دیارە ئەم چاوبەستن وفریودانە، لەکۆمەڵگای کوردی کراوەتە دیاردەو خەڵک تەنیا شتە ناشیرینەکانی دەسەڵات دەبینێت وبەرامبەر ئەمەش هەموو ئەو جوانیانانە فەرامۆش دەکات، کە لەناو خودی خۆیدا رەگی داکوتاوە .

لافاوەکەی هەولێر، سەرباری ئەو لایەنە نەرێنیانەی قسەی زۆری لەسەر کرا، وەکو هەموو بابەتێکی تر، بووە هۆی هێنانە ئارای گەڕەلاوژەیەکی سیاسی لەنێوان هێرش بردن وبەرگریکردن، پێگەیەکی گرنگی لە میدیاو تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان گرتەوە، جارێکی تر ئەو جوانیانە فەرامۆش کران، کە دوژمنانی کورد، بەخۆماڵی ودەرەکیەوە کار لەسەر تیکشکاندن وناشیرینکردنی دەکەن، ئەویش بەرزی گیانی بەتەنگەوە هاتن ویارمەتدانی یەکترە لەناو کۆمەڵگای کوردی! کەس ئەو سەرمایەدار وهەژارو مامۆستا وپیاوی ئاینی و کاسب وخوێندەوارو نەخویندەوارەی سلێمانی وهەڵەبجە ودوزخۆرماتوو وگەرمیان ودهۆک وزاخۆی نەبینی وسەرنجی رانەکێشا، کە بەوپەڕی بەرپرسیاریەتی وگیانی مرۆیی ونەتەوەییەوە، کۆمەکیان بۆ لێقەوماوان وزیانلێکەتووانی لافاوەکەی هەولێر کۆدەکردەوە، هیچ دیمەنێک وەک دیمەنی ئەو ئاژەڵدارانە جوان نەبوو، کەلەچاوی لێقەوماوی خۆیانەوە سەیری شوانەکەی هەولێریان

دەکرد وبەدەست وديارى، رانێک لەسەر مەڕ وئاژەڵى تر، هاتنە تازيەبارى ئەو شوانە کۆست کەوتووە! ديمەنى ئەو گەنجە خۆبەخشانەى کۆمەک ويارمەتيان کۆدەکردەوە، سەرنجى کەسى رانەکێشا! نازانم بۆ نووسەرانى کورد، کار لەسەر نيشاندان وبەرز نرخاندنى ئەو ديمەنە جوانانە ناکەن!؟ کە گيانێکى کەم وێنەيەو موچڕک بەجەستەى مرۆڤ دادەهينێت وئەوە دەسەلمێنێت، کە کورد لەباشوور، سەربارى هەموو شتێک، تاوەکو ئێستا ئەو جوانيانەى پاراستووە، کە شايەنى مانەوە وپێشکەوتن بێت .

لافاوەکەى هەولێر ئەوەى سەلماند، کە تا ئێستا گيانى نەتەوەيى بوون ومرۆڤ بوون لەناو ناخى تاکى کورددا رەگى داکوتاوە وهيچ هێزێک نەيتوانيوە وناتوانێت هەڵيتەکێنێت، لەپاڵ ئەوەدا ئەوەى جێگاى داخە جگە لە خەڵکى شارو گوندەکانى باشوورى کوردستان، هيچ شارێکى ترى ئێراق، سەربارى ئەوەى هەولێر باوەشى بۆ هەموويان کردەوە ولە تاريکترين چرکە ساتەکانياندا، سەربارى ئەوەى ئەوان بەشداريان لە جينۆسايد کردن ورەشە کوژکردنى کورد کردبوو، باوەشى بۆ کردنەوە وتاوەکو ئێستا لەهەولێر ژيانێکى پڕ ئاراميان بۆ دابينکراوە، کەچى هێندەى من زانياريم هەبێت، کەسێکم نەبينى، نە رۆشنبير ونەرێکخراوەکان و نە ...نە...نە بير لەوە بکاتەوە، وەک شارەکانى ترى کوردستان بير لە بەهاناوەچوونى هەولێر بکاتەوە!

هيوادارم تاکى کورد، بەرۆشنبيرو خويندەوار ونەخوێندەوارەوە، کار لەسەر بەرزنرخاندن وبەهێزکردنى گيانى هاريکارى وبەتەنگەوەهاتنى يەکار بکەن وبيپارێزن، لەبەرئەوەى ئەو گيانە کۆڵەگەيەکى سەرەکى مانەوە وبەردەوام بوونەو هەوێنێکى رەسەنە بۆ لەيەکتر نزيککردنەوە وريکخستنەوەى ناومالّى کوردى.

# نووسەر لە چەند دێڕێکدا

کامەران احمد محمدامین (کامەران مەنتک)
قوتابخانەی سەرەتایی وناوەندی لەشاری هەولێر تەواوکردوە.
ساڵی 1982 ئامادەیی پیشەسازی بەشی کارەبای لەهەولێر تەواوکردوە
.
ساڵی1992 بەشداری لەتاقیکردنەوەی دەرەکی بۆ پۆلی شەشەمی ئامادە
یی بەشی وێژەیی کردوە.
ساڵی 1997 بەکالۆریۆسی لەمێژوو، لەکۆلیژی ئەدەبیاتی زانکۆی سە
لاحەدین بەدەست هێناوە.
ساڵی 2000 ماستەر لەمێژوو، هەر لەهەمان کۆلیژوزانکۆدا.
ساڵی2007 دکتورا لەفەلسەفەی مێژووی پەیوەندییەنێودەوڵەتییەکان ،
زانکۆی موسڵ.

-ساڵی 2000 بەکالۆریۆس لەیاسا ، زانکۆی سەلاحەدین.
- لە ساڵی 2011 پلەی زانستی بەرزکراوەتەوە بۆ پلەی پڕۆفیسۆری یاریدەدەر.
- ساڵی 2017 پلەی زانستی بەرزبۆتەوە بۆ پلەی پڕۆفیسۆر لە بواری فەلسەفەی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان.

## ئەزموونی وانەبێژی

لە-2004 لەکۆلیژی مافی زانکۆی سەحەدین وانەی گوتوەتەوە وەک وانەبێژێک لەبەشی راگەیاندنی پەیمانگای تەکنیکی هەولێر وانەی گوتوەتەوە.
ئێستا مامۆستایە لەکۆلیژی زانستەرامیاریەکان لەزانکۆی سەلاحەدین - هەولێر

## بەرهەمەبڵاوکراوەکانی

### بەزمانی کوردی

#### ئەدەبی

فرمێسکی ئەستێرە، - شعر - 1988
پریاسگەی رێگای سەرکەوتن ، چامە1992
بێوار ، رۆمانێکی مێژوویی ، بەرگی یەکەم _کۆچ - 2004
بێوار ، رۆمانێکی مێژوویی ، بەرگی دووەم ، گێژەن – 2005
بێوار، رۆمانێکی مێژوویی، بەرگی سێیەم، گەڕانەوە- کتێبی ئەلیکترۆنی- 2021

### فەلسەفەی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان

- کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتی وناوچەییدا ، توێژینەوەیەکی سیاسی – ئابووری. بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم، 2000
-کوردستان لەسیاسەتی هەرێمایەتیدا 1932-1955، بڵاوکراوەکانی سە نتەری نما، 2010.
-بازرگانی رەشی نەوت وداڕشتنەوەی پەیوەندیە هەرێمایەتیەکان، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، 2017

–دارِمان وبەکۆتا هاتنی ئیمپراتۆریای ئەمریکی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، 2017
– کوردستان بەرەوکوێ، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، 2018
– کورد لە پرۆژەی رێگای ئاوریشمی نوێدا – توێژینەوەیەک لە دیپلۆماسیەت وستراتیژەتی چین لە دەستپێشخەری –پشتێنەورێگا، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم، سلێمانی، 2020.
– پەیوەندیەکانی نێوان تورکیاورێکخراوی داعش لە روانگەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتیەوە، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم، سلێمانی، 2020
–کوردستان لە رۆژگارە سەختەکاندا، کۆمەڵە وتار، کتێبی ئەلیکترۆنی– 2021
–کوردستان لەگۆڕانکارییەکانی سیستەمی جیهانیدا، بەرگی یەکەم، بەکۆتاهاتنی تاکجەمسەری وشەڕی نوێی سارد
– کوردستان لەگۆڕانکارییەکانی سیستەمی جیهانیدا، بەرگی دووەم، کوردستان لە پرۆژەی ئۆڕاسیادا

**فەلسەفەی مێژوو**

– ئازادی لەنێوان فەلسەفەویاسادا ، توێژینەوەیەک لەفەلسەفەی یاساوسیاسەتدا، بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم، 2005
– دیالێکتیکی زەمەنی مێژوویی وخوێندنەوەیەکی تر بۆ زانستی مێژوو، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر 2017
– شیکردنەوەوهارمۆنەتیزەکردنی مێژوو، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر 2018

**بەزمانی عەرەبی**

**فەلسەفە**

–السیاسه الدولیة فی ضوء فلسفة الحضارة، دراسه تحلیلیة نقدیة، دار المعرفة، لبنان ، 2009.

**بەرهەمە بڵاونەکراوەکان**

**ئەدەبیەکان**

-تۆڵە، رۆمان.
-گوڵی ئەفسوناوی ، کورتەچیرۆک.
-هاواری بێدەنگ، کۆمەڵەشیعر

**توێژینەوە(کتێب)**
- دەروازەیەک بۆ بیرکردنەوەی ستراتیژی، 2021
-کۆبانی ومملانێیەنێودەوڵەتییەکان
-تورکیاوکۆمەڵگای نێودەوڵەتی
-ئازادی وشارستانیەت ، توێژینەوەیەک لەفەلسەفەی مێژوو.
-نەتەوایەتی وبزاڤی نەتەوایەتی کوردی.
-راپەڕینەکانی کوردی لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم لەژێر رۆشنایی گۆڕانکاریەئابوریەکاندا.
-کۆمۆتراژیدیاکانی هەرێمی کوردستان ومانیفێستی قۆناغێکی نوێ
-کوردوبەدیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگای کوردی
-زانکۆ یا نەزانکۆی سەلاحەدین، نوقورچێکی توند لەجەستەیەکی مردوو

**به زمانی عەرەبی**
-إنحطاط الامبراطورية الأمريكية وسقوطها - دراسة في ضوء فلسفة الحضارة.
-النفط وإعادة صياغة العلاقات الاقليمية في الشرق الاوسط، دراسة في ضوء فلسفة العلاقات الدولية
-ثلاثية القوى العظمى(روسيا، الصين، الهند) ومستقبل أوراسيا
-دراسة تاريخية سياسية تحليلة
-تغير طبيعة القوى وأثره في العلاقات الدولية- دراسة في ضوء فلسفة العلاقات الدولية
-الحرية بين جدلية العقل والارادة - دراسة فلسفية تاريخية

**وتار**

